

# ژیانی هاوەڵان

## بۆ نەوجەوانان



نیهاد جەلال حبیب الله




بەشی یەکەم

ژیانی هاوەڵان بۆ نەوجەوانان-بەشی یەکەم
نووسینی:  نیهاد جلال حبیب الله


چاپی دووەم  ٢٠٢٢ز-١٤٤٣ك



نوسینگەی تەفسیر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێرست - نوسینگەی تەفسیر
حبیب الله ،  نیهاد جلال
ژیانی هاوەڵان بۆ نەوجەوانان-بەشی یەکەم،  نیهاد جلال حبیب الله (نووسەر).
٢٨٦ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، مێژوویی، ئاینیی
ISBN: 978-9922-654-71-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٩) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین:  نوسینگەی تەفسیر

## پێشکەشە:

* بەوەی نزایەکی خێر بۆ باوکی ئازیزم و دایکی میهرەبانم دەکات.

* بە خوشک و براکانم، هاوسەر و منداڵەکانم، برازا و خوشکەزاکانم.

* بە هەموو منداڵێکی سەر ئەم زەوییە.

* بەو مامۆستایانەی یەکەم پیتی خوێندنیان فێرکردووم، تا ئەمڕۆ.

* بەو کەسەی لە نزای خێر بێبەشم ناکات.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، خوایە هەموو ستایشێک بۆ تۆ، خوایە هەموو سوپاسێ بۆ تۆ بەو جۆرەی شیاوی شکۆ و گەورەییتە، سەڵات و سەلامی خوا بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیزمان (محمد) بە دایک و باوکەوە بەقوربانی بین. سەڵات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی دەوری.

ئەم نووسینەی بەردەستتان، هەوڵێکی سەرەتاییە، هەتا بتوانین لە ژیانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، تا ئەمڕۆ برێ نموونەی کەسە گەورە و خواناسەکان بخەینە بەردەستی منداڵە ئازیزەکانمان، تا بتوانن پێشەنگییان پێوە بکەن و درێژە بەو ڕێبازە بدەن، بەرگی یەکەمی تایبەت کراوە بە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و چەند جارێک چاپ کراوە، بەرگی دووەمیشی تایبەت بوو بە خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بەرگی سێهەمیشی تایبەت بوو

بە هـاوەڵان کە ژیـانی پـازدە هـاوەڵی لەخـۆدەگرت، بەرگـی چوارەمیشـی تـایبەت بـوو بە هەڵکەوتەکـانی ئیسـلام و تیایـدا ژیـانی یـازدە هەڵـکەوتەی نـاو مێـژووی ئیسـلامی باسـکرابوو، هەریەک لەوانەش دوو جـار چـاپ کـران، بەڵام بە پێویسـتمان زانـی ئەم بەرهەمە دەوڵەمەنـدتر بکەیـن، بـۆیە بەم چەشـنە گۆڕانکاریمان تێدا کرد:

بەرگـی یەکەمـمـان تـایبەت بە ژیـانی پێغەمـبەر(ﷺ) هێشتەوە.

بەرگـی دووەمـان لەگەڵ ژیـانی هـاوەڵانی تـر یەکخسـت و تیایدا جگە لە پێنج خەلیفەکە، ژیانی پازدە هاوەڵیشمان داناوە.

بەرگی سێهەم درێژە پێدەری ژیـانی هـاوەڵانە و تیایـدا ژیـانی چل و پێنج هـاوەڵی تـری تێدایە، واتە بە خەلیفەکانیشـەوە ژیـانی شەست و پێنج هاوەڵ باسکراوە.

بەرگی چوارەمان تایبەت کرد، بە هەڵکەوتەکانی ئیسـلام و لە بری یـازدە کەسـایەتی، ژیـانی سـی هەڵـکەوتەی نـاو مێژووی ئیسلامیمان باسکردووە.

هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستی خوا بوون و خوا لەوان ڕازی و ئەوانـیش لەخـوا ڕازی بـوون، هەر ئەوان بـوون وەک پەپـولە بە دەوری پێغەمـبەردا(ﷺ) دەهـاتن و دەچـوون و خۆیـان

کـرد بە پردێـک، تـا ئەم ئـایینەی خـوا بگەیەنــن بە سـەرجەم مرۆڤایەتی.

هەر ئەوان بـوون پشـتیان کـردە چێـژە کاتیەکـان و بەرگەی سەختیەکانیان گـرت لە پێنـاو ڕازی کردنـی خـواو ڕزگـارکردنی مرۆڤایەتیدا.

بۆیە بەڕاستی پێویستە ئەوانە بکەینە سەرمەشق بۆ خۆمـان و منداڵ و نەوەکانمان، تا ڕێی سەرفرازی بگرین.

لێرەدا ژیـانی هـاوەڵانی خۆشەویسـتمان بە نمـوونە هێنـاوە و لە شـــێوەی گێـــڕانەوەی ژیانیـــان و پرســـیار و وەڵام و پەنـــد و ئامۆژگاریــدا ژیـــانی هەرکـــام لەوانمـــان هێنـــاوە، دواجـــاریش کۆمەڵێکــک پرســـیارمان دانـــاوە، تـــا منـــداڵی ئـــازیز بەدوای وەڵامەکانیانـــدا بگەڕێـــت کەوەڵامەکانیشـــیان لە خـــودی ئەم نووسینەدا هەن.

بەو هیـوایەی خـوای گەورە ئەم کـارەی لێوەرگرتبین و پـاک و پوخت تەنها لەپێناو خۆیدا بێت.

خەڵکیش بە گشـتی و منـداڵی موسڵمان بە تـایبەتی سوودی لـێ ببینـن و ئەو هـاوەڵانە بـکەنە پێشـەنگی ژیانیـان، بە ئومێدی ئەوەش هەر کەس ئەو نووســینە دەخــوێنێتەوە، ئەگەر تەنهـــا بە یەک نزاش بێت ئەم بەندەی خوایە، لە نزا بێ بەش نەکات.

﴿إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي
إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾

نهاد جلال حبيب الله

## ١- أبوبكر الصديق (رضي الله عنه)

یەکەمین و خۆشەویستترین هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا (أبوبكر الصديق)بوو کەپێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە حەزی دەکرد لەگەڵ پێشەوا (أبوبكر)دا بێت، هەر بۆیە لە هەموو تەمەنیدا ڕۆژێک لە یەکتر دوور نەدەکەوتنەوە.

پێشەوا (أبوبكر الصديق) خۆی ناوی (عبدالله بن عثمان) بوو کەباپیرە گەورەیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) یەکێک بوو، بەڵام خەڵکی پێیان دەوت (أبوبكر).

پرسیار: بۆچی  بە پێشەوا (أبوبكر)یان دەوت (الصديق)؟

وەڵام: چونکە پێشەوا (أبوبكر) هەمیشە باوەڕی بە قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دەکرد و بەرانبەریان دوودڵ نەبوو، (الصديق)یش بە واتای کەسی زۆر ڕاستگۆ دێت، چونکە هیچ کەس نەبوو وەک پێشەوا (أبوبكر) بە بێگومان باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ)هێنابێت.

پێشەوا (أبوبكر)ی ئازیز یەک ساڵ لە دوای لەدایکبوونی

پێغەمبەر(ﷺ) لەدایکبووە، پێشەوا (أبوبکر) لە شاری (مکة)دا لە دایکبوو.

شاری (مکة) ناوچەیەکی وشک و کەم ئاو بوو، چواردەوری شاخ بوو، زەوییەکەی کشتوکاڵی تێدا نەدەکرا، بەڵکو خەڵکەکەی خەریکی بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بوون.

کەعبەی ماڵی خواش لە شاری (مکة)دا بوو، بۆیە زۆربەی خەڵک ئەو شارەیان لا پیرۆزبوو و سەردانیان دەکرد، لە شاری (مکة)دا خەڵکی هەژار و دەوڵەمەند هەبوون، دەوڵەمەندەکان زۆر خراپ بوون و یارمەتی هەژارەکانیان نەدەدا، خەڵکەکەشی بتیان دەپەرست.

پرسیار: بتپەرستی واتای چییە؟

وەڵام: بتپەرستی واتە: کەسێک لە جیاتی ئەوەی خوای گەورەیی خۆشبوێت و پەرستشی ئەو بکات، بڕوات بت بپەرستێت کە لە دار و بەرد و قوڕ دروستکراوە، یان مرۆڤ بپەرستێت کەلاوازە و توانای خودای نییە، ئەمەش لە ئاییینی ئیسلامدا کوفرێکی گەورەیە، بەڵکو دەبێت موسڵمان تەنها خودا بپەرستێت و ئەوی خۆشبوێت.

**دایک و باوکی:**

باوکی پێشەوا (أبوبکر) ناوی (عثمان بن عامر) بوو کەخەڵکی پێیان دەوت (أبو قحافة)، لە سەرەتادا باوکی بتپەرست و بێباوەڕبوو، بەڵام لە کۆتاییدا موسڵمانبوو، دایکیشی ناوی (سلمی بنت صخر) بوو کەخەڵکی پییان دەوت (أم الخیر).

دایکی پێشەوا (أبوبکر)یش بتپەرست و بێباوەڕ بوو، بەڵام دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا دایکی پێشەوا (أبوبکر) ماوەیەکی زۆری پێنەچوو موسڵمان بوو.

دایک و باوک و کەسانی پێشەوا (أبوبکر) لە شاری (مکة)دا هەژار و کەم دەسەڵات بوون، چونکە ئەوان هیچ کار و بارێکی شارەکەیان بەدەستەوە نەبوو، تا ئەوەی پێشەوا (أبوبکر) توانی دەسەڵات وەرگرێت.

پرسیار: ئەی پێشەوا (أبوبکر)یش وەک دایک وباوکی بتپەرست بوو؟

وەڵام: پێشەوا (أبوبکر) هەرگیز بتپەرست نەبووە و باوەڕی وابوو دەبێت کەسێک بپەرسترێت کە لە هەموو شتەکان بەهێزتربێت.

باوکی پێشەوا (أبوبکر) هەوڵیدەدا هەر لە منداڵییەوە (أبوبکر) بکات بە بتپەرست، بەڵام پێشەوا (أبوبکر) سەیری کرد

بتەکان ناتوانن هیچ سوودێکی پێبگەیەنن، بۆیە بڕیاریدا بتەکان نەپەرستێت، بەڵکو یەکسەر بەردێکی گرتە بتەکەی بەرانبەری.

**ژیانی منداڵی پێشەوا (أبوبكر)(ﷺ):**

پێشەوا (أبوبكر) هەر لە منداڵییەوە بە ئاکار و ڕەوشتی جوان خۆی ڕاهێنابوو، ئەو هەوڵیدەدا خۆی لە خراپە و ناپاکی دووربخاتەوە، بەڵکو لە جیاتی ئەوەدا خۆی فێری شتە جوانەکان دەکرد، تا زیرەک و بە توانابێت.

خەڵکی (مكة) سەرقاڵی کاری خراپ و مەی (خمر) خواردنەوەبوون، ئەوان بتیان دەپەرست، لە دار و بەرد و خورما بتیان دروستدەکرد و دوایی پێیان دەوت خودا، فێری داوێن پیسی بووبوون و ستەمیان لە یەکتری دەکرد، بەڵام پێشەوا (أبوبكر) ئامادە نەبوو هیچ کات وەک ئەوان بکات، بەڵکو هەوڵیدەدا خۆی فێری ئیشی چاک بکات و هاوڕێیەتی کەسی چاکی دەکرد، ئەو بوو بە هاوڕێی (محمد بن عبدالله)(ﷺ)، چونکە هەردووکیان ڕقیان لە کاری ناپەسەند بوو و حەزیان لە ڕەوشتی جوان دەکرد.

## پەنـد و ئامۆژگاری:

١- دەبێـت لەنـاو هـاوەڵانی پێغەمـبەر(ﷺ) دا پێشـەوا (أبوبكر)مـان لە هەموویـان زیـاتر خۆشـبوێت، چـونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە هەموویان زیاتر خۆشویستووە.

٢- ئەگەر خەڵکی هەموویان سەرقاڵی کارێکی خراپ بن، نابێت ئێمەش وەک ئەوان بکەین و بڵێین بۆچی ئەوان وادەکەن، با ئێمەش وا بین، بەڵکو دەبێت وەک پێشەوا (أبوبكر) لە خراپە ڕابکەین و بچین بزانین چ ڕەوشتێک جوانە ئەوە بکەین، تا خەڵکانیش لە ئێمەوە فێرببن.

٣- بتپەرستی، یان مرۆڤپەرستی تاوانێکی گەورەیە و مرۆڤ پێی بێباوەڕ دەبێت، بەڵکو دەبێت ئێمە جگە لە خوا هیچ کەس نەپەرستین، تەنها لە ئەو بترسین و تەنها ئەومان لەلا گەورەبێت، چونکە هەموو شتەکان هی خوای گەورەن، ئیتر بت و مرۆڤ و پاشا ئەوانە هەموویان لەناو دەچن.

٤- دەبێت مرۆڤی ژیر بەپەلە هاوڕێی چاک پەیدا بکات و پێکەوە سەرقاڵی ڕەوشت و کاری چاکە بن.

٥- دەبێت هەر لە منداڵییەوە کەسی چاک و بە ڕەوشت بین، نەوەک بڵێین با گەورە بین، ئینجا چاک دەبین.

## پێشەوا (أبوبکر)(رضي الله عنه) لەگەڵ دایک و باوکیدا:

پێشەوا (أبوبکر) هەمیشە لەگەڵ دایک و باوکیدا باش بوو، هیچ کەس نەبوو بڵێ (أبوبکر) ئەو خراپەی کرد، دایک و باوکی زۆر لە پێشەوا (أبوبکر) ڕازی بوون، ئەو هەوڵیدەدا دڵیان نەڕەنجێنێت و بە هەموو شێوەیەک دڵیان خۆش بکات.

پێشەوا (أبوبکر) دەچوو ئیشی دەکرد و پارەی بەدەستدەهێنا و شمەکی دەهێنایەوە و خزمەتی دایک و باوک و خوشکەکانی دەکرد، کاتێک ئایینی ئیسلام هات، پێشەوا (أبوبکر) هەوڵیدەدا دایک و باوکی موسڵمان بن، دوای ماوەیەک دایکی موسڵمان بوو، بەڵام باوکی هەر موسڵمان نەبوو، بەڵام پێشەوا (أبوبکر) نەکەوتە ئازاردان و تووڕەبوون لە باوکی، بەڵکو هەموو جار نزای خێری بۆ دەکرد، تا موسڵمان بێ.

## پێشەوا (أبوبکر)(رضي الله عنه) ئیش دەکات:

دوای ئەوەی پێشەوا (أبوبکر) کەمێک گەورە بوو، بڕیاریدا خۆی فێری ئیش بکات و بکەوێتە ئیشکردن، تا یارمەتی باوکی بدات، لەبەرئەوەی (مکة) ناوچەیەکی وشک و زەوی کەم پیتی هەبوو، بۆیە زیاتر سەرقاڵی بازرگانی دەبوون لە نێوان ناوچەکاندا.

پێشەوا (أبوبکر)یش هەوڵیدەدا خۆی فێربکات و بە بێکار دانەنیشێت، بۆیە پاش ماوەیەک، بوو بە بازرگانێکی شارەزا و لێهاتووی شارەکە، ئینجا پێشەوا (أبوبکر) هەوڵیدا تەنها سەرقاڵی بازرگانی نەبێت و بەس، بەڵکو لەبەرئەوەی کەسێکی بەڕێز بوو و هەموان خۆشیان دەویست، خەڵکی بڕیاریاندا کارێکی شارەکەی پێ بسپێرن، تا بیبات بەڕێوە، چونکە دڵنیابوون ئەو زۆر شارەزا و زیرەک و ڕاستگۆیە.

پرسیار: ئەو ئیشەی دایانە دەستی پێشەوا (أبوبکر) چی بوو؟

وەڵام: ئەو ئیشە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی مافی کەسی کوژراو، واتە: هەرکەسێ بکوژرایە پێشەوا (أبوبکر) مافی خوێنی ئەو کوژراوەی دەسەندەوە، بۆ ئەوەی کەمێک لە ستەم نەمێنێت.

لەو ماوەیەدا پێشەوا (أبوبکر) هەمیشە هاوڕێیەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد و هەردووکیان سەردانی یەکتریان دەکرد، هەردووکیشیان لەبەر ئاکار و ڕەوشتی جوانیان یەکتریان زۆر خۆشدەویست.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت زۆر ڕێزی دایک و باوکمان بگرین و بەرانبەریان هەڵوێستی جوانمان هەبێت، بەڵکو تا دەتوانین یارمەتییان بدەین و

بە هەموو جۆرێک دڵیان خۆش بکەین، خۆ جاری وا هەیە بە یەک قسەی خۆش کەسێک دڵی دایک و باوکی خۆش دەکات.

ئەگەر دایک وباوکمان چاک نەبوون، یان نوێژیان نەکرد، نابێت قسەیان پێ بڵێین، یان لێیان توورە بین، بەڵکو دەبێت بە قسەی خۆش پێیان بڵێین و نزای خێریان بۆ بکەین، تا چاک ببن.

موسڵمان نابێت تەمبەڵ و بێ ئیش بێت، بەڵکو دەبێت خۆی فێری ئیشێکی باش و حەڵاڵ بکات.

### موسڵمانبوونی پێشەوا (أبوبکر)(ﷺ):

پێشەوا (أبوبکر) لە ماوەی گەشتەکانیدا بەدوای ئایینێکی دروستدا دەگەڕا، تا باوەڕی پێ بهێنێت، بەڵام هیچ ئایینێکی بە ڕەوا نەبینییەوە، تا ئەوەی محمد(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا و ئایینی ئیسلامی ڕاگەیاند، یەکسەر (أبوبکر) چوویە خزمەتی و بەبێ یەک و دوو باوەڕی پێهێنا، بەمە لەناو پیاواندا (أبوبکر) یەکەم کەس بوو کەموسڵمان بوو، خۆشەویستی پێشەوا (أبوبکر) بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێندەی تر زیادیکرد و بەماڵ و گیان ئامادە بوو خۆی بخاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و پەیامەکەی، هەروەها

لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)بانگەوازی بۆ پەیامەکە دەکرد و لەسەر دەستی ئەو چەند کەسێک موسڵمان بوون.

پرسیار: پێشەوا (أبوبكر) چۆن ماڵ و سامانی لە پێناو خزمەتی پەیامەکەدا بەکاردەهێنا؟

وەڵام: پێشەوا (أبوبكر) بەو ماڵ و سامانە زۆرەی کە هەیبوو ئەو کۆیلانەی ئازاد دەکرد کەموسڵمان بووبوون و ئازار دەدران، وەک ئەوەی (بلال الحبشي)و شەش کەسی تری ئازادکرد.

پرسیار: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) بەم کارانەی پێشەوا (أبوبكر)ی دەزانی؟

وەڵام: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە چاکی دەیزانی کەپێشەوا (أبوبكر) بەماڵ و گیانەوە لە پێناو پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ)خۆی ماندوو دەکات، بۆیە دەیفەرموو: (ان الله بعثني اليكم فقلتم: كذبت، و قال أبوبكرصدقت، و واساني بنفسه و ماله)،صحيح البخاري (٣٦٦١) واتە: (خوای گەورە منی بۆ ئێوە نارد، بەڵام ئێوە بەدرۆتان خستمەوە، بەڵام (أبوبكر) باوەڕی پێهێنام و بە ماڵ و گیانەوە یارمەتی دام و پشتگیری کردم).

لەو ماوەیەدا کەبانگەواز بە نهێنی بوو، پێشەوا (أبوبكر) بە نهێنی دەچوو بۆ لای کەسانی باوەڕپێکراو و باسی پەیامی ئیسلامی بۆ دەکردن و بانگی دەکردن بۆ پەیامەکە و ئەوانیش

باوەڕیـــان دەهێنـــا، لەوانەیـــش پێشـــەوا (عثمـــان بـــن عفـــان)بوو کەیەکێک بوو لە ناوداران و دەوڵەمەندەکانی (مكة) و دوایی بـــوو بە موســـڵمانێکی زۆر بـــاش و پێغەمـــبەر(ﷺ)مـــوژدەی بەهەشـــتی پێـــدا، پێغەمـــبەریش زۆر بەو هەوڵ و بـــانگەوازەی (أبوبكر الصديق)دڵخۆشبوو.

پرسیار: دەتوانی ناوی چەند کەسێ بڵێیت کە لە سەردەستی پێشەوا (أبوبكر) موسڵمانبوون؟

وەڵام: بەڵێ، کەسانی وەک: (عثمان بن عفان)، (طلحة بن عبيد الله)، (سعد بن أبي وقاص)، (الزبير بن العوام)، (عثمان بن مظعون)و چەندێکی تر لەسەر دەستی (أبوبكر الصديق) موسڵمان بوون.

### ئازاردانی پێشەوا (أبوبكر)(ﷺ):

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان لەلای کەعبەدا بوون، پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئایینی ئیسلامی بۆ بێباوەڕان دەکرد، کەچی ئەوان کەوتنە لێدانی موسڵمانان و پێغەمبەر(ﷺ)، بەمە هاوەڵان هەریەکەیان بە لایەکدا ڕایانکرد، بەڵام پێشەوا (أبوبكر الصديق) لەلای پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە و بەرگری لێکرد، بێباوەڕان کەوتنە ئازاردانی پێشەوا (أبوبكر) و هێندەیان لێدا، تا

ئەوەی پێشـەوا (أبـوبكر) لە هـۆش کەوت، دوایـی (أبوبكر)یـان خستە نـاو بەرگێک و بردیـانەوە بۆ مـاڵەوە، دایکی کە ئەمەی بینی دەستی کرد بە گریان.

پێشەوا (أبوبكر)ی ئازیز وا دەموچاوی پڕبووە لە خوێن، ئازاری زۆری دراوە، هەرکە پێشـەوا (أبـوبكر) هۆشـی بەخۆیـدا هـاتەوە، یەکسەر هەواڵی پێغەمـبەری پرسـی، دایکی لێی تووڕەبوو، وتـی جارێ با باش بیتەوە، بەڵام ئەو سوێندی خوارد کەهـیچ نـاخوات تـا نەچێـتە لای پێغەمـبەر(ﷺ)، کاتێـک یەکیـان بینـی هەردووکیان دەستیانکرد بە گریان و دەستیان کردە ملی یەکتر و پێغەمـبەر(ﷺ) نێوچـاوانی پێشـەوا (أبـوبكر)ی مـاچکرد، هەر لەوێ دایکی پێشەوا (أبوبكر)یش موسڵمان بوو.

پرسیار: پێشەوا (أبوبكر) لە کوێدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی؟

وەڵام: پێشـەوا (أبـوبكر) لە مـاڵی (الأرقـم بـن أبـي الأرقـم المخزومـي)دا پێغەمـبەر(ﷺ)ی بینـی، چـونکە ئەوێ شـوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانان بوو.

**پەنـد و ئامۆژگاری:**

کاتێـک قسـەی ڕاسـت و دروسـتمان بیسـت، دەبێـت یەکسـەر باوەڕی پێبکەین، ئەگەر کەسێ بانگی کـردین بۆ ئیشـی چاکە دەبێت بەبێ دوودڵی گوێڕایەڵی بین.

دەبێت هەوڵبدەین دەوروبەر و ناسراوەکانیشمان فێری کاری چاکە بکەین، نەوەک تەنها لە بیری خۆماندا بین، وەک چۆن پێشەوا (أبوبکر) چەندین کەسی بۆ ئیسلام بانگکرد بۆ ئەوەی موسڵمان بن.

موسڵمان نابێت لە دوژمن بترسێت، بەڵکو دەبێت لەسەر پەیامەکەی بەردەوام بێت و ڕاستیەکان بڵێت، ئەگەریش ئازار بدرێت هەردەبێت وازنەهێنێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر الصديق)یش ئازاردراون.

دەبێت پێغەمبەر(ﷺ)مان لە هەمووکەس زیاتر خۆش بوێت، تەنانەت لە خۆمان و دایک و باوکمان زیاتر خۆشمان بوێت، وەک چۆن پێشەوا (أبوبکر) بەوپەڕی ئازار و نەخۆشییەوە لە بیری پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو.

## کۆچکردنی پێشەوا (أبوبکر)(ﷺ) بۆ (مدينة):

پاش ئەوەی بێباوەڕەکان بەردەوام ئازاری موسڵمانەکانیان دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە موسڵمانەکان کرد، تا کۆچ بکەن بۆ شاری (مدينة)، چونکە هەندێک لە خەڵکی شاری (مدينة) موسڵمان بووبوون و ئامادەبوون بە هەموو شێوەیەک خزمەتی موسڵمانەکان بکەن، بۆیە موسڵمانان هەموو کەوتنە کۆچ کردن، پێشەوا (أبوبکر)یش ویستی کۆچ بکات بۆ (مدينة)،

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێنەدا و فرمانی پێکرد، تا لە (مكة)دا بمێنێتەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای هەموو موسڵمانانەوە ویستی کۆچ بۆ (مدينة) بکات، پێشەوا (علي) لە ماڵەکەی خۆیدا دانا و خۆی چوو بە شوێن پێشەوا (أبوبكر)دا، تا پێکەوە کۆچ بۆ (مدينة) بکەن. پێشەوا (أبوبكر) لە خۆشیدا دەستیکرد بە گریان، ئینجا چوو دوو وشتری هێنا کە ئامادەی کردبوون، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) پارەی یەکێکیانی پێدا، ئینجا بە نهێنی کۆچیانکرد، کاتێک بێباوەڕەکان بەمەیان زانی کەوتنە شوێنیان.

پێغەمبەر(ﷺ)و پێشەوا (أبوبكر) لە ڕێگەدا چوونە ناو ئەشکەوتێک لەسەر ڕێگەکەیان کە ناوی ئەشکەوتی (ثور) بوو، بێباوەڕەکان کاتێک گەیشتنە لای ئەشکەوتەکە سەیری ئەشکەوتەکەیان کرد و نەچوونە ژوورەوە و دوای ماوەیەک چوون.

پرسیار: پێشەوا (أبوبكر) و پێغەمبەر(ﷺ)لەو کاتەدا چییان کرد؟

وەڵام: لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) نەدەترسا و دڵنیابوو، بەڵام پێشەوا (أبوبكر) دەترسا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (لا

تحزن ان الله معنا) واتە: (مەترسە خوامان لەگەڵ دایە خۆ ئێمە بەتەنها نین).

پێشەوا (أبوبکر) و پێغەمبەر(ﷺ) سێ ڕۆژ لەناو ئەشکەوتەکەدا مانەوە، ئینجا ڕێگەناسەکەیان گەشتە شوێنی مەبەست و دیاریکراو و لەوێوە کۆچەکە دەستی پێ کرد، تا ئەوەی گەیشتنە شاری (مدینة)، موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر) هاتن بۆ (مدینة) و ڕێزێکی زۆریان لێگرتن، بەمجۆرە پێشەوا (أبوبکر) لە پێناو ئیسلامدا شارەکەی خۆی بەجێهێشت.

**پەند و ئامۆژگاری:**

ژیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا خۆشترین ژیانە، بەڵام ئەمڕۆ کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نەماوە، دەبێت ئێمەی موسڵمانیش لەگەڵ فەرموودەکانیدا ژیان بەسەربەرین کە بەڕاستی ژیانێکی خۆشە.

پێغەمبەر(ﷺ) هەر فەرمانێک بکات دەبێت گوێڕایەڵی بین، وەک چۆن (أبوبکر) لەبەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچەکەی دواخست.

موسڵمان ترسی لە هیچ کەس نییە جگە لە خوای گەورە نەبێت، چونکە ئەگەر بکوژرێت بۆ لای خوای خۆی دەچێتەوە،

ئەگەریش ڕزگاری بێت، ئەوا زیاتر پەرستشی خوای گەورە دەکات.

ئەگەر ئێمە ڕاستگۆ و باوەڕداری چاک بین، خوای گەورە یارمەتیمان دەدات و لە دەست خراپەکاران ڕزگارمان دەکات.

## ژیانی پێشەوا (أبوبكر)(ﷺ) لە (مدينة):

پێشەوا (أبوبكر) لە (مدينة)شدا هەمیشە هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، لە مزگەوت، بازاڕ و جیهاددا پێغەمبەر(ﷺ)ی جێ نەدەهێشت، بەڵکو پێشەوا (أبوبكر) کچەکەی خۆی کردە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، بەمجۆرە پێشەوا (أبوبكر) خەزووری پێغەمبەر(ﷺ)بوو.

(مدينة) شارێکی خۆش و هێمن بوو، زۆربەی ئەوانەی لەوێ بوون موسڵمان بوون، پێشەوا (أبوبكر) سەرقاڵی ئامۆژگاری کردنی خەڵک و یارمەتی دانی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، دەبوایە پێشەوا (أبوبكر) لە هەموو جەنگەکاندا بەشداری بکات کە پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدابوو، چونکە ئەو بڕیاری وابوو کە ژیانی لە خزمەت ئەودا بێت.

ژیانی پێشەوا (أبوبكر) لە (مدينة) ژیانێکی سادە و ساکاربوو، ئەو زۆر لەسەرخۆ بوو و تووڕە نەدەبوو، مەگەر لە

پێناوی خوای گەورەدا تووڕە بوایە، کەسێکی خێرخوازبوو و زۆربەی ئەو سامانەی کە هەیبوو لە پێناو خوای گەورەدا دەیبەخشی، ئامادەبوو خۆی برسی بێت، بەڵام موسڵمانێک برسی نەبێت. ئەو کەسێکی زۆر بە ئیمان بوو، هەردەم لە ترسی خوای گەورە و سزای دۆزەخ دەگریا، بەرانبەر بە منداڵان بەسۆز بوو، بەڵکو دڵی منداڵانی خۆش دەکرد، کەسێکی هێندە چاک بوو هەمووان خۆشیان دەویست.

پێشەوا (أبوبکر) لە هەموو جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا بەشداری دەکرد. ئەو دەبوایە، پارێزەری پێغەمبەر(ﷺ)بێت و ئامادەبوو گیانی خۆی لەپێناو پێغەمبەر(ﷺ)دا بەخت بکات، بەڵکو هەرچی جارێک پێغەمبەر(ﷺ)ی بانگ دەکرد دەیفەرموو: بە دایک و باوکەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، تەنانەت یەک جەنگ نییە کەپێغەمبەر(ﷺ) بەشداری بووبێت و پێشەوا (أبوبکر)ی تێدا نەبووبێت.

پرسیار: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ پێشەوا (أبوبکر)دا چۆن بوو؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ)یش پێشەوا (أبوبکر)ی لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەویست و حەزی دەکرد هەمیشە لەگەڵیدا بێت و هەردەم نزای خێری بۆ دەکرد، لە کاروبارەکانی ژیانیدا ڕاوێژی

پێ دەکرد، تا بزانێت ڕای پێشەوا (أبوبکر) چۆنە. وەک دەبینی لە جەنگی بەدردا گوێی لە ڕاوێژەکانی پێشەوا (أبوبکر) گرت و دیلەکانی نەکوشت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) هەردەم بە هاوەڵانی دەفەرموو کە(أبوبکر) لە هەمووتان باوەڕدارتر و خۆشەویستترە.

**پێشەوا (أبوبکر)(رضي الله عنه) لەکاتی مردنی پێغەمبەردا(ﷺ):**

لە کۆتا حەجی پێغەمبەر(ﷺ)دا کە بە حەجیماڵئاوایی ناسراوە، پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی بۆ موسڵمانان پێشکەش کرد و باسی ئەوەی کرد کە بەندەیەکی خوا دوو شتی خراوەتە بەردەم، تا یەکێکیان هەڵبژێرێت، یەکەم: ژیان لە دنیادا، دووەم: گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، بەندەکەش دووەمی هەڵبژارد. پێشەوا (أبوبکر) بەم قسە دەستیکرد بە گریان، چونکە زانی ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە،(ﷺ) کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە.

کاتێک گەڕانەوە بۆ (مدینـة)، پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش کەوت و نەخۆشیەکەی زیادیکرد و لە ماڵەوەدا کەوت، پێشەوا (أبوبکر)یش جێی نەدەهێشت و لە خزمەتکردنیدا بەردەوام بوو. ئازاری پێغەمبەر هێندە زیادی کرد کە نەیدەتوانی نوێژ بۆ موسڵمانان بکات، بۆیە داوایکرد تا پێشەوا (أبوبکر) نوێژیان بۆ بکات.

بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدەدا جگە لە (أبوبکر) کەسی تر لە هاوەڵان نوێژەکە بۆ موسڵمانان بکات. پێشەوا (أبوبکر)یش بە غەمباری و دڵگرانییەوە نوێژەکەی بۆ موسڵمانان دەکرد و لە نوێژەکەیدا دەگریا.

ڕۆژی مەرگی پێغەمبەری ئازیزمان هات و پێشەوا (أبوبکر)یش لە لای بوو، بەڵام موسڵمانان بەو حاڵەی پێغەمبەر(ﷺ)زۆر دڵگران بوون، بۆیە پێشەوا (أبوبکر) ئامۆژگاری و دڵنەوایی دەکردن. کاتێک پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد، پێشەوا (أبوبکر) چوویە ژوورەوە و دەبینێت ئازیزمان گیانی سپاردووە، بۆیە فرمێسکەکانی چاوی دادەبارین و بەوپەڕی گریان و غەمبارییەوە نێوچەوانی پێغەمبەر(ﷺ)ی ماچکرد و فەرمووی: بە دایک و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا.

گریان و بێزاری موسڵمانانی داگرتبوو وەک ئەوەی هەریەکەیان وەک شێتی لێهاتبوو و نەیدەزانی چی بکات، پێشەوا (عمر) تووڕە بوو و وتی: هەر کەس بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) مردووە بە شمشێر لە ملی دەدەم.

پرسیار: ئەی هەڵوێستی پێشەوا (أبوبکر) چۆن بوو؟

وەڵام: پێشەوا (أبوبکر) لەگەڵ ئەوپەڕی دڵگرانیدا خۆی

ڕاگرت و چوویە لای پێشەوا (عمر) و هێوری کردەوە، ئینجا کەوتە قسەکردن بۆ موسڵمانان و وتی: (ئەوەی (محمد)ی دەپەرست ئەوا (محمد) مرد، ئەوەی خوا دەپەرستێت ئەوا خوای گەورە زیندووە و نامرێت). پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل أفإن مات أو قتل أنقلبتم علىٰ أعقابكم...).

بەڵێ، هەرچەندە گەورە و بەڕێز بیت، هەر دەبێت بمریت چونکە مردن لە ڕێگەی هەموو مرۆڤێکدایە (انک میت و انهم میتون)(تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن).

بەم هەڵوێستەی پێشەوا (أبوبکر) پێشەوا (عمر) تێگەیشت کە بەڵێ ڕاستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) مردووە، بەڵام خۆ خودای گەورە نەمردووە، بەڵکو دەبێت چاکە بکەین، تا بگەین بە بەهەشت و جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) ببینینەوە. هاوەڵانیش لە مردنی پێغەمبەر(ﷺ)دڵنیابوون و هێندەی تر گریان و غەمباری دایگرتن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت ئێمەش وەک پێشەوا (أبوبکر) هەموو تەمەنمان لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا ببەینە سەر، ئەویش بەوە دەبێت ژیان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فێربین و ئیشیان پێبکەین و لە هیچ فەرموودەیەکی لانەدەین، تا بتوانین لە ڕۆژی دواییدا بە دیداری شاد بین.

مرۆڤەکان دەبێت هەموویان بمرن، بەڵام کەسی ژیر ئەوەیە بەپەلە کردەوەی چاکە بۆ دوای مردن کۆدەکاتەوە، چونکە هەرکەس مرد ئیتر ناتوانێت هیچ کارێکی چاکە ئەنجام بدات.

دەبێت موسڵمان لەوپەڕی خەمباریدا خۆی ڕابگرێت و لە فرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) لانەدات، بڕوانە هەڵوێستی پێشەوا (أبوبکر) کە چۆن لە مەرگی پێغەمبەر(ﷺ)دا خۆی ڕاگرت و موسڵمانانی تریشی تێگەیاند کە دەبێت خۆمان ڕابگرین، جگە لەوەی فێری کردن خوای گەورە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەورەتر و خۆشەویستترە و هەرگیز نامرێت.

**خەلیفایەتی پێشەوا (أبوبکر الصدیق)(ﷺ):**

دوای کـــۆچی دوایـــی پێغەمـــبەر(ﷺ) کۆمەڵێـــک لە موسڵمانان کۆبوونەوە، تـا سەرکردەیەک بۆ موسڵمانان دابنێن، موسـڵمانەکان لە کەپـری (بنـی سـاعدە) کۆبـوونەوە، کاتێـک پێشـەوا (عمـر) و (أبـوبکر) ئەمەیـان بیسـت، بەپەلە چـوون بـۆ ئەوێ، تا ئاگاداری بارودۆخەکە بن، و لەوێ کەوتنە قسە کردن لەسەر ئەوەی کێ ببێت بە سەکردەی موسڵمانان، تا بێ سەرکردە نەبـن. لە کۆتاییـدا هەمـووان بە پێشـەوا (أبـوبکر) ڕازی بـوون، بـۆیە پێشـەوا (عمـر) بەپەلە دەسـتی خسـتە نـاو دەسـتی پێشـەوا (أبوبکر) و بەیعەتی پێدا، ئەوانی تـریش وەک پێشەوا (عمر)یـان کرد، بۆیە هەموو موسڵمانان لە مزگەوتدا بەیعەتیـان بە (أبـوبکر الصدیق)دا.

پرسیار: بەیعەت بە واتای چی دێت؟

وەڵام: بەیـــعەت واتـــا ڕازیبـــوون بە خەلیفـــایەتی، یـــان ســـەرکردایەتی کەسـێک. ئینجـا پێشـەوا (أبـوبکر) وتـارێکی پێشکەش کرد و تیایدا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی لەسەر ئیمان و بەخششەکانی کرد و سەڵاواتی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)دا، پاشان ڕوونیکـردەوە کە ئەویش وەک موسڵمانانی تـر مـرۆڤێکە،

ئەگەر گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەوا گوێڕایەڵی بکەن، ئەگەریش هەڵەی کرد دەبێت موسڵمانان ڕاستی بکەنەوە و نەهێڵن ئەو هەڵەیە بکات. پاشان باسی ئەوەی کرد هەر گەلێک جیهادی واز لێهێنا، ئەوا خوای گەورە لە ژێر دەستی دوژمنەکانیاندا زەلیل و لاوازیان دەکات، ئینجا چەند ئامۆژگاریەکی تری کردن، پاشان داوای لێکردن هەستن نوێژەکەیان بکەن.

پرسیار: مەبەست لە جیهاد چییە کە پێشەوا (أبوبکر) باسی کرد؟

وەڵام: مەبەستی جیهاد بریتییە لە: جەنگان لە پێناو خوای گەورەدا دژ بە دوژمنانی ئیسلام، تا بێباوەڕان نەتوانن زیان بە موسڵمانان بگەیەنن و موسڵمانان ئایینی خوا بە مرۆڤایەتی بگەیەنن و دوژمنان ڕێگەیان لێنەگرن.

پێشەوا (أبوبکر) دواتر سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان بوو، ئەو زۆر بە دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی موسڵمانی دەکرد، شەوانە بە کووچە و کۆڵانەکاندا دەگەڕا، تا بزانێت بارودۆخی ژیانی موسڵمانان چۆنە، بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا و یارمەتی هەژاران و کەمدەستانی دەدا، تەنانەت یارمەتی پیرەکانی دەدا و ماڵی بۆ پاک و خاوێن دەکردنەوە و دڵخۆشی دەکردن.

پێشەوا (أبوبکر) و (عمر) پێشبڕکێیان لەسەر ئەوە دەکرد

کامیان زیاتر ئیشی چاکە بکەن و بڕۆن بە پیری خەڵکی هەژار و بێ تواناوە، ئەمە وایکردبوو خەڵکی زۆر لەو و پێشەوا (عمر) ڕازی بن و خۆشیان بوێت.

پێشەوا (أبوبکر) لەسەردەمی دەسەڵاتیدا چوار ئیشی زۆر گرنگی کرد کەبە ڕاستی کارانێکی قورس بوون:

١. بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی خۆیان بە پێغەمبەر دەزانی.
٢. لێدانی ئەوانەی لە ئایینی ئیسلام و بنەماکانی ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە.
٣. کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز.
٤. بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ناوچەکانی تر و ڕزگارکردنی چەند ناوچەیەک.

**یەکەم:** بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی خۆیان بە پێغەمبەر دەزانی:

لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا، پێش ئەوی پێغەمبەر کۆچی دوایی بکات چەند کەسێک کەوتنە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەر(ﷺ)یش دەیزانی کە درۆ دەکەن، چونکە لە دوای محمد(ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت.

پێغەمبەر(ﷺ)خۆی فەرمووبووی کە لە دوای خۆی چەند کەسێک داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و ئەوانە درۆ دەکەن، پێشەوا (أبوبکر) لە سەردەمی دەسەڵاتیدا بڕیاریدا ئەو کەسانە لەناو ببات کەداوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و لە دوای هەوڵ و

جەنگێکی سەخت توانی هەموو ئەو ناڕاست وخراپەکارانە لەناو ببات.

پرسیار: ئەو کەسانە کێ بوون کەداوای پێغەمبەرایەتییان دەکرد؟

وەڵام: ئەمـــانە گرنگتـــرین ئەو کەســـانە بـــوون کەداوای پێغەمبەرایەتییان دەکرد (الأسود العنسي)، (مسيلمة الكذاب)، (لقيط بن مالک الأزدي)، سجام)، بەڵام هەندێکیان کوژران و هەندێکی تریان تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ ئیسلام.

**دووەم:** لێـــدانی ئەوانەی لە ئـــایینی ئیســـلام و بنەماکـــانی هەڵدەگەڕانەوە:

لە دوای مردنـی پێغەمـبەر(ﷺ) کۆمەڵێـک لە هۆزەکـان لە ئـــایینی ئیســـلام پەشـــیمان بـــوونەوە، هەنـــدێکیان دەیـــانوت: پێغەمبەر(ﷺ)مردووە و ئیتر ئیسلامیش نەما، هەندێکی تریش دەیـــانوت ئـــێمە زەکاتمـــان بە پێغەمـــبەر(ﷺ) دەدا، ئێســـتاش پێغەمبەر(ﷺ) مردووە و زەکات نادەین، بەڵام پێشەوا (أبوبكر) بڕیاریـدا لەمـانە بـدات، موسڵمانان ترسـان و وتیـان: دەبێـت شـەڕ نەکەیـن، بەڵام پێشـەوا (أبـوبكر) سـوێندی خـوارد کە دەبێـت ئەم شـەڕە بکرێـت، ئینجـا پێشـەوا (أبـوبكر) چەنـدین سـوپای بـۆ هەریەک لەو هـۆزانە نـارد، تـا بگەڕێـنەوە نێـو ئیسـلام، لە

کۆتاییدا توانی بە سەریاندا سەرکەوێت، بەم جۆرە ڕێگەی نەدا پەرتەوازەبوون و پاشگەزبوونەوە لە نێو موسڵماناندا بمێنێت.

**سێیەم:** کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:

لە ماوەی ئەو جەنگانەدا کۆمەڵێکی زۆر لەو هاوەڵە بەڕێزانە شەهید بوون کە قورئانی پیرۆزیان لەبەربوو، بۆیە پێشەوا (أبوبکر) و (عمر) بڕیاریاندا بکەونە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز و لە یەک بەرگدا بینووسنەوە، بۆ ئەمەش پێشەوا (أبوبکر) کارەکەی دا بەدەستی (زید بن ثابت) کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا نووسەری قورئان بوو، دوای هەوڵێکی زۆر ئەوکارە گەورەش تەواو بوو و هەموو قورئان لە یەک بەرگدا کۆکرایەوە و پارێزرا.

**چوارەم:** بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ناوچەکانی تردا و ڕزگارکردنی چەند ناوچەیەک:

پێشەوا (أبوبکر) لە سەردەمی خیلافەتیدا هەستا بە ناردنی چەند سوپایەک بۆ ڕزگارکردنی ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی بێباوەڕەکاندا بوون، یەکەمجار سوپاکەی (أسامة بن زید)ی نارد کە پێشتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردبوو، تا بڕوات و لە بێباوەڕان بدات.

سوپاس بۆ خوا سوپای موسڵمانان سەرکەوتن و چەند

ناوچەیەک هاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوە کە پێشتر بێباوەڕ بوون، بەمجۆرە پێشەوا (أبوبکر) توانی لە ماوەی خیلافەتیدا بەو پەڕی هەوڵ و ماندووبوونەوە گرفت و ئازارەکانی موسڵمانان نەهێڵێت.

پرسیار: زەکات بە واتای چی دێت؟

وەڵام: زەکات بریتییە لە بەخشینی بڕێک لەو پارە زۆرەی کە موسڵمان هەیەتی لە پێناو خوای گەورەدا، ئەمە لە ئیسلامدا وەک نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن وایە.

**مردنی پێشەوا (أبوبکر)(ﷺ):**

پێشەوا (أبوبکر) ماوەیەک پێش مردنی ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد، تا بزانێت لە دوای خۆی کێ ببێت بە خەلیفەی موسڵمانان، ڕەئی لەسەر ئەوە بوو کەپێشەوا (عمر) بێت، بۆیە پێشەوا (أبوبکر) بڕیاریدا لە دوای خۆی پێشەوا (عمر) ببێت بە فەرمانڕەوای موسڵمانان، ئینجا وەسییەتی بۆ پێشەوا (عمر) کرد، تا کاری چاک بکات و دادپەروەر بێت و خراپە نەکات، پاش ماوەیەک (أبوبکر) لە جێگادا نەخۆش کەوت و هێندەی نەبرد کۆچی دوایی کرد، موسڵمانان هەمووان دڵگران و غەمباربوون و شارەکە بە یەکجار گریان و دڵتەنگی دایگرتەوە، خوای گەورە لەگەڵ پێشەوا (أبوبکر)دا هاوبەشمان بکات، تا لە بەهەشتدا لەگەڵیدا بین.

**پەنـــد و ئـامۆژگـاری:**

نابێت موسڵمانان هیچکات بەبێ سەرکردە بمێننەوە، بەڵکو دەبێت هەمیشە سەرکردەیان هەبێت، وەک چۆن هاوەڵان بەپەلە پێشەوا (أبوبکر)یان هەڵبژارد.

هەرچەندە دەسەڵات و پایەمان بەرزبێت و دەوڵەمەند بین، دەبێت لەگەڵ خەڵکدا چاک بین وئاگاداری هەژاران بین.

پێویستە موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا وەک پێشەوا (أبوبکر) و (عمر) پێشبڕکێ لەسەر کاری چاکە بکەن.

مردن لە ڕێگەی هەمووماندایە و کەسمان لێی دەرباز نابین، بۆیە پێویستە بە پەلە خۆمان ئامادە بکەین.

دەبێت خۆشەویستی پێشەوا (أبوبکر) هەمیشە لە دڵماندا بێت و گوێ لە وەسییەتەکانی بگرین و شارەزای ژیانی بین، تا بتوانین پەند وئامۆژگاری لێ وەربگرین.

## پرسیارەکان

- پێشەوا (أبوبکر) ناوی چی بوو؟ بۆچی پێیان دەوت صدیق؟
- پێغەمبەر(ﷺ) کام لەمانەی زیاتر خۆش دەویست؟

(أبوبکر الصدیق). (عمر بن الخطاب). (زید بن ثابت).

- ناوی دایک و باوکی پێشەوا (أبوبکر) چی بوو؟ ئایا ئەوان موسڵمان بوون؟ پێشەوا (أبوبکر) لەگەڵیاندا چۆن بوو؟
- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد کۆچ بکەن بۆ (مدینة)؟ ئەی لە کۆچەکەیدا کێ بوو بە هاوڕێی؟
- وشەی ڕاست هەڵبژێرە:

(أبوبکر) لە منداڵیدا:

١- موسڵمان بوو.

٢- بت پەرست بوو.

٣- بتی نەدەپەرست و ڕێک و پێک بوو.

یەکەم کەس لە پیاواندا کە موسڵمان بوو:

(عثمان بن عفان). (حمزه بن عبدالمطلب). (أبوبکر الصدیق).

ئەو کەسەی هەستا بە کۆکردنەوەی قورئان:

(ابوسفیان بن حرب). (حسن بن علي). (زید بن ثابت).

- دەتوانی باسی ژیانی (أبوبكر) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە (مدينة)دا بکەیت؟

چۆن پێشەوا (أبوبكر) بوو بە خەلیفەی موسڵمانان؟

- هەڵوێستی پێشەوا (عمر) و (أبوبكر) لە بەرانبەر کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دا باس بکە.
- گرنگترین ئەو باسانە چی بوون کەپێشەوا (أبوبكر) لە وتاری خەلیفەبوونیدا باسی کرد؟
- زەکات بە واتای چی دێت؟
- گرنگترین کارەکانی پێشەوا (أبوبكر) لە سەردەمی خیلافەتیدا بژمێرە؟
- پێشەوا (أبوبكر) لە پێش مردنیدا چی کارێکی گرنگی کرد؟
- ئایا ئامادەیت باسی ژیانی پێشەوا (أبوبكر) بۆ کەسێک، یان هاوڕێکەت بکەیت؟
- ئەگەر پێشەوا (أبوبكر) زیندوو بوایە، تۆ چیت پێی دەوت؟
- چ پەند و ئامۆژگارییەک لە ژیانی منداڵی پێشەوا (أبوبكر) وەردەگریت؟

- بزانە پێشەوا (أبوبكر الصديق)لە پێناو ئیسلامدا چۆن ئازاردراوە؟
- پێشەوا (أبوبكر) چۆن لە ئەشکەوتی (ثور)دا ترسا؟ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو؟

## ٢- (عمر بن الخطاب)(رضي الله عنه)

پێشەوا (عمر بن الخطاب) یەکێ بوو لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ) کەڕێزێکی زۆری لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان هەبوو، (عمر) هاوەڵێکی زۆر ئازا و نەترس و باوەڕدار بوو، پێغەمبەری خوای زۆر خۆشدەویست، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوی زۆر خۆشدەویست و موژدەی چوونە بەهەشتی پێدابوو، پێشەوا (عمر) هێندە دلێر و باوەڕدار بوو کەئەو بە هەر شوێنێکدا بچوایە، شەیتان نەدەچوو بەوێدا و لە دەستی ڕایدەکرد.

دوای مردنی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، (عمر) ماوەیەک لەگەڵ پێشەوا (أبوبکر)دا بوو، تا ئەوەی پێشەوا (أبوبکر)یش مرد. ئەوجا پێشەوا (عمر) بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، بۆیە پێویستە بە جوانی شارەزای ژیانی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ)بین و سوود لە ژیانی وەربگرین.

**لەدایکبوونی (عمر)(ﷺ):**

لە ناو شاری (مكة)دا کەسێک هەبوو کە ناوی (الخطاب) بوو، (الخطاب بن نفيل) بوو. (الخطاب) کەسێکی تووڕە و توند و بتپەرست بوو، ئەو ئیشی ئاژەڵداری دەکرد، کاتێک (الخطاب) گەورە بوو ژنێکی بە ناوی (حنتمة بنت هاشم)ی هێنا، ئەم ئافرەتە ئامۆزای (ابو جهل) بوو، ئەوان ژیانی خۆیان بەسەردەبرد، تا ئەوەی لە دوای سێزدە ساڵ لە پاش لە دایک بوونی پێغەمبەر(ﷺ)منداڵێکیان بوو و ناوی (عمر)یان لێنا.

پرسیار: ناوی دایک و باوکی (عمر) چی بوو؟

وەڵام: ناوی باوکی (الخطاب) و ناوی دایکیشی (حنتمة) بوو.

پرسیار: ئایا دایک و باوکی (عمر) لە کوێ دەژیان؟

وەڵام: دایک و باوکی (عمر) هەردووکیان عەرەب بوون و خەڵکی (مكة) بوون، هەر لە وێش ژیانیان دەبردە سەر، دایک و باوکی (عمر) هەر لە سەرەتاوە هەوڵیاندا (عمر) فێری ژیانی ناو کۆمەڵگەکەیان بکەن، ئەوان (عمر)یان فێری ئەوە دەکرد کە بتەکان خودای ئێمەن و دەبێت بیانپەرستین، ئەگەر نا بتەکان ئێمە لەناودەبەن و دەمانکوژن، هەروەها لەبەرچاوی (عمر)دا مەی (خمر)یان دەخواردەوە و فێری لاساریان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا

فێری چەند شتێکی جوانیان دەکرد، بەڵام باوکی (عمر) زۆر توورە بوو.

**پەند و ئامۆژگاری:**

پێویستە دایک و باوک منداڵەکانیان فێری کاری چاکە بکەن، نەک کاری خراپیان فێربکەن، ئەگینا دوایی منداڵەکەیان کەسێکی خراپەکار و تاوانبار دەردەچێت.

ئەگەر هەر کەسێک فێری کاری خراپەی کردین نابێت بە گوێی بکەین، ئەگەر دایک و باوکیشمان بێت.

**ژیانی منداڵی (عمر)(ﷺ):**

(عمر) وەک منداڵانی تری ناو (مکة) ژیانی دەبردە سەر، بەڵام ئەو لەناو هاوڕێکانیدا کەسێکی زۆر ئازا و دلێر بوو، ئەو هەر وەک منداڵانی تر کڕنووشی بۆ بتەکان دەبرد و بتەکانی بە خوا دەزانی، (عمر) لە کاروباری ژیاندا یارمەتی باوکی دەدا، بۆیە (عمر)ی منداڵ بڕیاریدا بچێت بۆ شوانی، تا ئەرکی سەرشانی باوکی کەم بکاتەوە، ئەو مەڕ و ماڵاتەکەی باوکی و چەند کەسێکی تری دەبرد بۆ دەرەوە و دەیلەوەڕاندن، واتە (عمر) یەکەمجار کاری شوانی دەکرد، بۆیە لەکاری شوانییەوە فێری گورج و گۆڵی و خۆڕاگری و ئازایەتی بوو.

بەڵام باوکی لەگەڵیدا زۆر خراپ بوو و هەموو جارێک قسەی ناشرینی پێدەوت و لێی دەدا، ئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی (عمر)ی کوڕی هەبوو، هەروەها (عمر) حەزی بە سوارچاکی هەبوو، بۆیە خۆی فێری سوارچاکی دەکرد و پێشبڕکێی دەکرد، جگە لەوەی شارەزایی لە شمشێر بەکارهێناندا هەبوو، جگە لەوەش (عمر) زۆر حەزی لە شیعر دەکرد و زۆرجار، یان شیعری لەبەر دەکرد، یان شیعری دەوت، ئەمەش وایکرد لەناو هاوڕێکانیدا دەربکەوێت و هەموویان سەرسامی (عمر) ببن.

ئەو هەوڵی دەدا هەردەم شارەزای ژیان و مێژووی باب و باپیرانی خۆی بێت و لەو بوارەدا زۆر زیرەک بێت، (عمر) ژیانی منداڵی خۆی بەوجۆرە بەسەردەبرد.

پرسیار: دەتوانیت بە خاڵ ئیشەکانی ژیانی منداڵی (عمر) بژمێریت؟

وەڵام:

١- کاری شوانی.

٢- سوارچاکی.

٣- شارەزایی جەنگ.

٤- ژیان لەگەڵ شیعردا.

٥- شارەزایی مێژووی باب و باپیرانی.

**ژیانی گەنجی (عمر)(ﷺ):**

(عمر) لە گەنجیدا فێری شتێکی تری گرنگ بوو کە بریتیبوو لە بازرگانیکردن، ئەو لەگەڵ بازرگانەکانی (مکة)دا بۆ ئیشی بازرگانی دەچوو بۆ دەرەوەی (مکة)، تا ئەوەی بە چاکی فێری ئەو ئیشە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا (عمر) ژیانی وەک خەڵکانی تری (مکة) بوو وە بتی دەپەرست، ئەوان لە خورما بتیان دروستدەکرد و لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد، تا لە ڕێگەی بازرگانییەکەیاندا بیپەرستن، کەچی کاتێک برسییان دەبوو لەجیاتی ئەوەی بیپەرستن خورماکەیان دەخوارد.

(عمر) بەردەوام لە بازرگانییەکەیدا قازانجی دەکرد، تا ئەوەی بوو بە یەکێ لە دەوڵەمەندەکانی شاری (مکة)، جگە لەوەش (عمر) لە شاری (مکة)دا جەنگاوەرێکی گەورە و دلێر بوو و کەس نەیدەتوانی جەنگی لەگەڵ بکات، بەڵکو لەبەر ئەو ئازایەتی و زیرەکی و لێزانییەی گەورەکانی (مکة) وەک نوێنەری خۆیان دەیانناردە بۆ لای پاشا و دەسەڵاتدارەکانی تر، لە کاتی جەنگیشدا ڕاوێژیان پێدەکرد.

(عمر) هێندە شارەزا و لێزان بوو، کاتێک جەنگ لە (مکة) ڕوویدەدا یان گرفتێک دروست دەبوو، دەچوون بە شوێن (عمر)دا

و پرسیاریان لێدەکرد کەچی بکەن، یان دەیانکرد بە دادوەری ئەو کێشەیە، تا چارەسەری بکات، (عمر) زۆر حەزی لەو ژیانە دەکرد و بەرگری لێدەکرد، ئامادەبوو بۆ پارێزگاریکردنی ئەو بارودۆخە گیانی خۆی بەخت بکات، دوایی (عمر) ژنێکی هێنا وماڵی پێکەوەنا، تا ئەوەی خوای گەورە کچێکی جوانی پێبەخشین.

پرسیار: دەکرێت گرنگترین کارەکانی تەمەنی گەنجی (عمر) بژمێریت؟

وەڵام:

١- بازرگانی کردن.

٢- بتپەرستی.

٣- جەنگاوەری.

٤- نوێنەرایەتی.

٥- دادوەری و چارەسەری گرفتەکان.

٦- ژنهێنان.

**پەند و ئامۆژگاری:**

نابێت دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکەیاندا تووڕە و توندوتیژ بن، بەڵکو دەبێت سۆزی زۆری پێ بدەن و خۆشیان بوێت، چونکە ئەوە بەخششێکی خوای گەورەیە کەپێی بەخشیون.

منداڵی ژیر دەبێت تەمبەڵ نەبێت و یارمەتی دایک و باوکی خۆی بدات و خۆی فێری ئیشی چاک بکات، وەک (عمر بن الخطاب)خۆی فێری شوانی و بازرگانی کرد.

بتپەرستی کارێکی زۆر خراپە، سەیربکە بێباوەڕەکان بە خورما بتیان دروستدەکرد و پێیان دەوت خودا، کەچی کاتێک برسییان دەبوو دەیانخوارد، دەی بت کە ناتوانێت هیچ بکات، چۆن دەبێتە خودا؟!!

کەسی ژیر دەبێت، تا دەتوانێت چارەسەری کێشەی نێوان خەڵک بکات، نەوەک خۆی ئاژاوەگێڕ بێت.

**(عمر)(رضي الله عنه) دژایەتی ئیسلام دەکات:**

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە بانگەوازکردن بۆ ئایینی ئیسلام، خەڵکی (مكة) جگە لە چەند کەسێکی کەمیان نەبێت کە باوەڕیان هێنا کەوتنە دژایەتی کردنی، پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەکردن لەجیاتی بتی بێ گیان و مرۆڤی لاواز خودای گەورە

بپەرستن کە هەموو شتێکی بەدەستە، بەڵام ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد.

(عمر بن الخطاب)یش یەکێک بوو لەو کەسە بێباوەڕانەی کە بە توندی دژایەتی ئیسلام و موسڵمانانی دەکرد، ئەو حەزی دەکرد خەڵکی (مکة) لەسەر بێباوەڕی خۆیان بەردەوام بن، حەزیشی نەدەکرد پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان لەو شارەدا هەبن.

پرسیار: بۆچی (عمر بن الخطاب) دژی موسڵمانان بوو؟

وەڵام: چونکە (عمر) وا فێر کرابوو کە بتپەرست بێت، منداڵیش کە فێری شتێک بوو لەسەری بەردەوام دەبێت.

هەرکاتێک (عمر) باسێکی ببیستایە کە باسی ئیسلام بوایە، یەکسەر تووڕەدەبوو و ئامادەنەبوو گوێی لێبگرێت، تا بزانێت چی دەڵێن، بەڵکو یەکسەر دەکەوتە ئازاردانی موسڵمانان، ئەم کارەی خۆیشی بە کارێکی باش دەزانی، (عمر) کەنیزەکێکی هەبوو کە ئیشی ماڵەوەی بۆ دەکرد، ئەو کەنیزەکە کاتێک پەیامی ئیسلامی بەرگوێ کەوت یەکسەر باوەڕی پێهێنا و موسڵمان بوو، ئەو کەنیزەکە زۆر دڵی خۆشبوو بە ئایینی ئیسلام.

کاتێک (عمر) بەمەی زانی، تەواو تووڕەبوو و کەوتە ئازاردانی کەنیزەکەکەی، ئەو ڕۆژانە لە بەرچاوی خەڵکیدا دەکەوتە ئازاردانی کەنیزەکەکەی و پێی دەوت دەبێت واز لە

ئایینی ئیسلام بهێنیت، بەڵام کەنیزەکەکەی، زۆر خۆڕاگربوو و وازی نەدەهێنا، بەڵکو ئەو ئازار و سزای دنیای لا خۆشتر بوو لەوەی لە ڕۆژی دواییدا سزا بدرێت.

ڕۆژێکیان (عمر) ئازاری کەنیزەکەکەی دەدا، پێشەوا (أبوبکر) بەوێدا تیپەڕبوو کە ئەمەی بینی زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە چوو بە پارە ئەو کەنیزەکەی لە (عمر بن الخطاب)کڕی و ئازادی کرد.

(عمر) بەوەوە نەوەستا، ئەمجارەیان کەوتە ئازاردانی خوشکەکەی و زاواکەی کە موسڵمان بووبوون، هەروەک زاوای بەڕێزی خۆی (سعید بن زید)، دەفەرمووێت: (وەڵاهی گەر چاوت لێدەبوو چۆن (عمر) منی دەبەستەوە لەسەر ئیسلام بوونم پێش ئەوەی موسڵمان ببێت) اخرجه البخاري (٣٨٦٧). لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: (عمر) من و خوشکەکەی، دەبەستەوە لەسەر موسڵمان بوونمان و ئازاری دەداین پێش ئەوەی موسڵمان ببێت).

پرسیار: کەنیزەک واتای چییە؟

وەڵام: کەنیزەک ئەو ئافرەتانەن کە لە جەنگدا دەگیرێن و دوایی دەیانفرۆشن، یان خەڵکانێک دەیانکڕن، تا لە ماڵەوە ئیشیان پێ بکەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

مرۆڤ کاتێک بێ باوەڕ بوو سۆزی نامێنێت و ڕاستی لە بەرچاودا ون دەبێت.

(عمر بن الخطاب) تەنانەت ئامادە نەبوو گوێ بۆ موسڵمانان بگرێت، بەڵام (أبوبکر)، چونکە نرخی ئیمانی دەزانی پارە و ماڵ وگیانی خۆی لە پێناویدا بەختکرد.

موسڵمانانی پێشوو لە پێناو ئیسلامدا هەر ناڕەحەتیەکیان چەشتووە، دەبێت ئێمەش پەندیان لێ وەربگرین.

**موسڵمانبوونی (عمر بن الخطاب)(ﷺ):**

چەند باس و خواس و ڕیوایەتێک هەن دەربارەی هۆکاری موسڵمانبوونی (عمر بن الخطاب)(ﷺ)، یەکێک لەم گێڕانەوانە ئەوەیە (عمر) کاتێک دەیەوێت بچێت پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت، لەم کاتە یەکێک هەواڵی موسڵمانبوونی خوشکەکەی، زاواکەی پێ دەگەیەنێت و ئەویش خۆی دەگەیەنێتە ماڵی خوشکەکەی، لەوێ گوێی لە خوێندنی قورئان دەبێت و دەست دەکات بە ئازاردانی خوشکەکەی و زاواکەی، دواتر داوای پەڕەی قورئانەکە دەکات و دەیخوێنەتەوە و پێی سەرسام دەبێت و موسڵمان دەبێت.

گێڕانەوەیەکی تریش ئەوەیە کە هۆکاری موسڵمانبوونی

(عمر بن الخطاب)(ﷺ) گوێگرتی بووە لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) لە کەعبە.

بەڵام دەبینین گشت گێڕانەوەکان لاوازن و نابن بە هۆکاری موسڵمانبوونی (عمر بن الخطاب)(ﷺ) جگە لە دوعاکەی، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ دوو (عمر)ەکە کە داوای لە خوای گەورە کرد، یان (عمر بن الخطاب)، یان (عمر بن هاشم) بۆ ئیسلام ڕێنموونی بکات، تا ئایینی خوای پێ شکۆدار و بە هێز بێت، وەک دەفەرموێت(اللهم اعز الاسلام باحد العمرين عمر بن الخطاب او عمر بن هاشم).

لە ئەنجامدا خوای گەورە دوعاکەی، پێغەمبەر(ﷺ)ی قبوڵکرد و (عمر بن الخطاب)(ﷺ) هاتە نێو باوەشی ئیسلام و بە بێ ترس موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، هەروەک (ابن عباس)(ﷺ) دەفەرموێت:( یەکەم کەس کە ئیسلامبوونی خۆی بە ئاشکرا ڕاگەیاند (عمر بن الخطاب)(ﷺ) بوو). حسن اسناده شيخ الالباني في (صحيح السيرة) (ص ١٩٣).

**پەند و ئامۆژگاری:**

موسڵمان دەبێت هەمیشە نزای ئەوە بێت خوای گەورە مرۆڤەکان بۆ ئیسلام ڕێنموونی بکات، تا نەچنە دۆزەخ، ئەگەر

شیاوی ڕێنموونی نەبوون و زۆر خراپ بوون، ئینجا نزا بکەین خوای گەورە لەناویان بەرێت.

قورئانی پیرۆز کتێبێکی زۆر بە پێز و بە نرخە، بەتایبەت ئەگەر لە واتاکەی تێبگەین، زۆر زیاتر کاریگەری لە سەر دڵ و دەروونمان دەبێت.

کەسێک کە بەهێزبێت دەتوانێت ببێتە هۆکارێک بۆ سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان.

**پێشەوا (عمر)(ﷺ) کۆچ دەکات بۆ (مدینة):**

پاش ئەوەی بێباوەڕان ئازاری موسڵمانانیان دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بنکە بگوازێتەوە بۆ شاری (مدینة)، بۆیە فەرمانی بە موسڵمانان کرد، تا کۆچ بکەن بۆ شاری (مدینة)، پێشەوا (عمر بن الخطاب)یش بڕیاری کۆچی دا لەگەڵ موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ شاری (مدینة).

پێشەوا (عمر) سات بە سات چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد، تا بە دیداری شاد بێتەوە، (عمر) لەوێ لەگەڵ موسڵمانانی (مدینة)دا ژیانی دەبردەسەر و ئامۆژگاری دەکردن، تا لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام بن، ڕۆژانە لەگەڵ موسڵمانانی (مدینة) دەچوونە دەرێ، تا بزانن پێغەمبەر(ﷺ)دێت؟ تا ئەوەی ڕۆژێکیان کە چاوەڕێیان دەکرد

بینییان پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر) بەرەو (مدینة) هاتن، ئیتر پێشەوا (عمر)(رضي الله عنه) لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات.

## ژیانی پێشەوا (عمر)(رضي الله عنه) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ):

پێشەوا (عمر) هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو، ئەو لە مزگەوت و لە ماڵ و بازاڕ و جەنگدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بە جێ نەدەهێشت، لە هەرچی جەنگدا هەیە بەشداری دەکرد، چەندین جار قسەی کردووە، دواتر خوای گەورە پشتگیری قسەکەی پێشەوا (عمر)ی کردووە، پێشەوا (عمر) هیچ ترسی لە کوژران نەبوو، چونکە دەیزانی کوژران لە ڕێی ئیسلامدا شەهید بوونە، ئەو لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد و ڕۆڵێکی مەردانەی بینی.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دوای جەنگی بەدر ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد، چی بە دیلە بێباوەڕەکان بکەن، پێشەوا (عمر) داوای کرد با بکوژرێن، چونکە ئەوانە بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان هاتبوون، بەڵام پێشەوا (أبوبکر) داوایکرد، با نەکوژرێن و بە پارە، یان فێرکردنی منداڵانی موسڵمانان ئازاد بکرێن، پێغەمبەر(ﷺ) قسەی پێشەوا (أبوبکر)ی وەرگرت، تا ئەوەی خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی ڕاگەیاند کە دەبوایە، قسەکەی (عمر)ت وەربگرتایە.

بەڵکو لە چەند شوێنێکی تردا پێشەوا (عمر) قسەی کردووە و خوای گەورەیش پشتگیری قسەکەی ئەوی کردووە، لە جەنگی ئوحود و خەندەقیشدا بەشداری کردووە، لە ڕێککەوتننامەی حودەیبیە و فەتحی (مکة) و جەنگی خەیبەریشدا بەشداربووە.

هەتا ڕۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو و فرمانەکانی ئەوی جێبەجێ دەکرد.

پێشەوا (عمر) پێغەمبەر(ﷺ)ی زۆر خۆشدەویست و کاتێک بانگی دەکرد دەیفەرموو بەدایک و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوی زۆر خۆشدەویست و مژدەی بەهەشتی پێدابوو، (عمر)(رضي الله عنه) هێندە خواپەرست بوو کە شەیتانی نەفرەت لێکراو لە دەستی ڕایدەکرد.

## هەڵویستی پێشەوا (عمر)(رضي الله عنه) لە مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) دا:

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، پێشەوا (عمر) زۆر تووڕەبوو، چونکە پێغەمبەری ئازیزی زۆر خۆشدەویست.

(عمر) هاواریکرد هەرکەس بڵێ پێغەمبەر(ﷺ) مردووە بەم شمشێرە لە ملی دەدەم، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) چووە بۆ لای خوای گەورە و دەگەڕێتەوە بۆ لامان، لە غەمباریدا نەیدەزانی

چی بکات، تا ئەوەی پێشەوا (أبوبكر) هات و پێی وت کە ڕاستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، بەڵام خوای گەورە کۆچی دوایی نەکردووە، دەی کێ پێغەمبەر(ﷺ)ی خۆش دەوێت بێ گوێڕایەڵی پەیامی خوا بێت، تا لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بیگەیەنێت بە پێغەمبەری ئازیز، (عمر) بە بیستی ئەم هەواڵە لە ئەژنۆ کەوت و غەم وگریان دایگرت، وەک ئەوەی ژیانی هەمووی سەختی و ناخۆشی بێت، بەڵام خوای گەورە خۆڕاگری پێ بەخشی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت موسڵمان وەک پێشەوا (عمر) نەترس و ئازاو دلێر بێت، ئاخۆ ترسیان لە چی بێت، ئەگەر لە ماڵ و شار دەربکرێن هەر خوایـــان لەگەڵـــدایە، ئەگەریـــش بکـــوژرێن شـــەهیدییان دەســـتدەکەوێت و بـــۆ لای خـــوای گەورە و پێغەمـــبەری ئازیزمـــان محمد(ﷺ)دەگەڕێنەوە.

٢- دەبێـــت گـــوێڕایەڵی پێغەمـــبەر(ﷺ) بـــین، وەک چـــۆن پێشەوا (عمر) کە فەرمانی پێکرد یەکسەر کۆچی کرد.

٣- لە ژیانی پڕ لە ئیمانی پێشـەوا (عمـر)ەوە خۆشەویستیمان بۆی زیاد دەکات و هیواداریـن لە بەهەشتدا بیبینین.

٤- دەبێـــت موســـڵمانان لە نێـــوان خۆیانـــدا وەک پێشـــەوا (أبـــوبكر) و (عمـــر) ئامۆژگـــاری یەکتـــر بـــکەن و دڵنەوایـــی یەکتریش بدەنەوە.

## پێشەوا (عمر)(رضي الله عنه) لە سەردەمی خەلیفایەتی پێشەوا (أبوبكر)دا(رضي الله عنه):

دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانان کۆبوونەوە، تا بڕیار بدەن کێ ببێت بە جێنیشینی پێغەمبەر(ﷺ)و خەریکبوو لە نێوانیاندا کێشە ڕووبدات، تا ئەوەی بەپەلە پێشەوا (عمر) بڕیاریدا پێشەوا (أبوبكر) بێت و بەیعەتی پێدا. موسڵمانانیش ڕازی بوون و بەمە کێشەکەی چارەسەر کرد.

لە سەردەمی خیلافەتی پێشەوا (أبوبكر)دا، پێشەوا (عمر) وەک وەزیری پێشەوا (أبوبكر) وابوو، ئەو گوێڕایەڵی فرمانەکانی خەلیفە بوو، بەڵکو لە قسەی خەلیفە لای نەدەدا، پێشەوا (أبوبكر)یش لە بارودۆخ و کێشەکاندا ڕاوێژی بە پێشەوا (عمر) دەکرد، چونکە متمانەی زۆری پێی هەبوو.

پێشەوا (عمر) داوای لە پێشەوا (أبوبكر) کرد، تا قورئانی پیرۆز کۆبکرێتەوە و بنووسرێتەوە، ئەویش بە گوێی کرد و پێکەوە بیریان کردەوە، تا بزانن کێ بۆ ئەم ئیشە باشە، تا ئەوەی بڕیارياندا ئیشەکە بسپێرن بە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ)(زید بن ثابت).

(زید)یش بە گوێیکردن و ئیشەکەی بەجێگەیاند.

لە هەموو ژیانی پێشەوا (عمر) لە سەردەمی خیلافەتی خەلیفە (أبوبکر)دا لاسارییەکی نەنواند، هەر بۆیە لەبەر بەهێزی و زیرەکی و لێهاتوییەکەی پێشەوا (أبوبکر) لە سەرەمەرگیدا وەسییەتی کرد کە لە دوای خۆی پێشەوا (عمر) ببێتە جێنشینی و موسڵمانانیش گوێڕایەڵی بن و لە قسەی لانەدەن.

پێشەوا (عمر) لەگەڵ پێشەوا (أبوبکر)دا لەسەر کاری چاکە پێشبرکێیان دەکرد، شەوێکیان پێشەوا (عمر) بڕیاریدا بچێت بۆ ماڵی پیرەژنێکی پیری داماو کە لە ماڵەوەدا تەنهابوو، تا ئیشەکانی ماڵەوەی بۆبکات و خۆراکی بۆ ئامادەبکات، کەچی کاتێک چوو دەبینێت ئیشەکانی بۆ کراوە، پرسیاریکرد کە کێ ئەو ئیشانەی بۆ کردویت؟ ئەویش وتی: کەمێک پێش تۆ کەسێک کە بەو شێوەبوو هات ئیشەکانی بۆکردم، پێشەوا (عمر) یەکسەر زانی ئەو کەسە پێشەوا (أبوبکر)ی خەلیفەی موسڵمانانە.

## سەردەمی جێنشینی پێشەوا (عمر)(ﷺ):

ڕۆژی مەرگی پێشەوا (أبوبکر) هات، موسڵمانان تێکڕا گریان و ناڕەحەتی دایگرتن، بێزاری وڵاتی گرتبوویەوە، ئینجا ئەو ئازیزەیان شۆرد و نوێژی مردوویان لەسەر کرد و ئەسپەردەیان

کرد، دوایی لەسەر بڕیاری پێشەوا (أبوبكر) پێشەوا (عمر)یان کردە جێنشین و بەیعەتیان پێدا.

پێشەوا (عمر) وتارێکی بۆ خوێندنەوە و تێیدا پاش سوپاس و ستایشی پەروەردگار باسێکی پێغەمبەر(ﷺ)و پێشەوا (أبوبكر)ی کرد، ئینجا چەند قسە و ئامۆژگارییەکی بەسوودی بۆ موسڵمانان خستەڕوو، جارێکی تر موسڵمانان دڵیان گەشایەوە کە خۆشەویستێکی تری پێغەمبەر(ﷺ)بووە بە سەرکردەیان، ئەو کەسەی کە مژدەی بەهەشتی پێدراوەو شەیتان لە دەستی ڕادەکات.

پێشەوا (عمر) لە سەردەمی خیلافەتیدا دوو کاری گرنگی ئەنجامدا کەبریتی بوون لە:

١- ڕێکخستنی بەشەکانی دەوڵەت.

٢- گەشەدان بە فتوحاتی ئیسلام.

پێشەوا (عمر) لە ماوەی خیلافەتیدا، هەستا بەڕێکخستنی بەشەکانی دەوڵەت و بەشی سەربازی ڕێکخست، هەروەک چۆن بەشی یاساو...هتدی ڕێکخست، هەروەها گرنگی دا بە بواری دارایی، تا بە دادپەوەرانە بە سەر موسڵماناندا دابەش بکرێت، پێشەوا (عمر) مووچەی بۆ هەژار و کەم دەرامەت و بێ تواناکان بڕییەوە، جگە لەوەش زۆر گرنگی دا بە بزووتنەوەی فتوحات و لەسەردەمی ئەودا چەندین ناوچە فەتح کران کە

گرنگترینیان لە ناوبردنی دەوڵەتی ئاگر پەرستی ساسانی بوو، ئەمە بوویە مایەی ئازادکردنی کوردستان و ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەیشتە کوردستانیش، واتە پێشەوا (عمر) هۆکاری ئەوە بوو کە کوردەکان ئایینی ئیسلامیان پێ بگات.

هەروەها لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا (قدس)ی پیرۆز فەتحکرا، بەسەرهاتەکەشی ئەوەبوو کاتێک موسڵمانان ویستیان بچنە (قدس)ەوە، خەڵکەکەی نەیانهێشت و وتیان: دەبێت سەرکردەکەتان بێت، ئینجا کلیلی قودستان پێ دەدەین، پێشەوا (عمر)یش لەگەڵ (أسلم)ەی هاودەمیدا بە وڵاخێکەوە بەرەو (قدس) کەوتنەرێ کە لە (فلسطین)ە، لە رێگەدا هەرجارەو یەکێکیان سوار دەبوون، جارجاریش هیچکام سوار نەدەبوون، تا وڵاخەکە بحەسێتەوە، کاتێک گەیشتنە ئەوێ، خەڵکەکە یەکسەر پێشەوا (عمر)یان ناسیەوە و کلیلەکەیان پێدا، بەمە (قدس) ئازادکرا.

سەردەمی پێشەوا (عمر) سەردەمێکی دادپەروەری بوو، ئەو جل و بەرگی سادە و کۆنی دەکردە بەری، نانی کەمی بۆ خواردن هەبوو، زۆرجار برسی بوو، چونکە ئامادە نەبوو خۆی تێر نان بخوات و خەڵکی هەژاریش لە ماڵەوەدا نان نەبێت بیخۆن و بە برسێتی سەر بنێنەوە.

پێشەوا (عمر) لە ماڵەوە لەگەڵ منداڵەکانیدا رووی خۆش

بـوو، یـاری بـۆ دەکـردن و قسـەی لەگەڵ دا دەکـردن، ڕێـزی خێزانەکەی خۆی دەگرت، ئەگەر ژنەکەی لێی تووڕە بوایە، ئەم بە نەرمی لەگەڵیدا دەجووڵایەوە، بەڵکو بێدەنگ دەبوو و ڕێزی دەگرت بۆ ئەوەی کێشە لە نێوانیاندا ڕوونەدات.

ئەو ئازیزەمـان گـوێی لە قسـەی هەمـوو موسڵمانان دەگـرت، تەنانەت جارێکیان بڕیارێکی دەرکرد، ژنێک هەستاو وتی: ئەو بڕیارەت هەڵەیە، ئەویش وتی: (عمر) هەڵەی کرد و تۆ ڕاست دەکەیت، بۆیە بڕیارەکەی گۆڕی، ژیانی پێشەوا (عمر) چەندین بەسەرهاتی جوانی تێدایە کە تا ئەمڕۆش هەمـوو مرۆڤـایەتی باسی دەکەن و پێی سەرسامن.

پێشەوا (عمر) بە شەوان بە کۆڵانەکانی (مدینة)دا دەگەڕا، تـا بزانێـت بـاری ژیـانی ئەو خەڵـکە چـۆنە، شـەوێکیان بە کۆڵانێکـدا تێـپەڕی کـرد، سـەیری کـردماڵێـک ئاگریـان کـردۆتەوە و دایکێـک لایە لایە بۆمنـداڵەکانی دەکـات، پێشـەوا (عمر) سەلامی لێکردن و مۆڵەتی وەرگرت، تا بچێتە ژوورەوە.

ئینجا بە دایکەکەی وت: ئەوە چی دەکەیت؟ ئەویش وتی: منداڵەکانم برسییانە و نانیان نەخواردووە، منیش ئاگرم کردۆتەوە و بەردم خسـتۆتە نـاو ئەم مەنـجەڵە و ئـاوم تێکـردووە، تـا بیانخەڵەتێنم و بخەون، چونکە هیچ شتێکمان نییە بیخۆین، خۆ

(عمر)یش ئاگای لێمان نییە، بەلای خۆیەوە کاربەدەستمانە.

ئەو ژنە پێشەوا (عمر)ی نەناسیەوە، پێشەوا (عمر) بەپەلە چوو لە (بیت المال)ی موسڵمانان شمەکی بۆ هێنان و نانی بۆ ئامادەکردن و بۆ بەیانییەکەیشی مووچەی بۆ بڕینەوە.

پرسیار: (بیت المال) واتای چییە؟

وەڵام: (بیت المال) بریتییە: لە ماڵی گشتی موسڵمانان کە بە دادپەروەرانە و بە پێی یاسای ئیسلام بەسەر خەڵکی نێو دەسەڵاتی ئیسلامیدا دابەش دەکرێت.

شەوێک پێشەوا (عمر) کە بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا گوێی لە ئافرەتێک بوو بە کچەکەی خۆی دەوت: ئاو بکەرە ناو شیرەکەوە، با بۆ فرۆشتن زۆر بێت، خۆ (عمر) لێرە نییە تا سزامان بدات، بەڵام کچەکەی وتی: دایە گیان، ئەگەر (عمر) لێرە نییە خۆ پەروەردگاری (عمر) لێرەیە. کاتێک پێشەوا (عمر) ئەمەی بیست زۆر خۆشحاڵ بوو و ئەو کچەی بۆ کوڕەکەی خۆی هێنا.

دەگێڕنەوە کە کۆمەڵێک لە خەڵکی ئێران هاتن بۆ لای پێشەوا (عمر)، تا بیبینن، کاتێک پرسیاریان کرد: لە کوێیە؟ هاوەڵان پێیان وتن: بڕۆن لەوێدا ڕاکشاوە، ئەوانیش کە چوون دەبینن کەسێکی هەژارە و بە جل وبەرگێکی کۆنەوە ڕاکشاوە و

نەعلەکانی خستۆتە ژێر سەری، ئەوانیش زۆر سەریان سوڕما چۆن دەبێت سەرکردەی وڵات بەو جۆرە بێت.

پێشەوا (عمر) خۆی ڕۆژانە لە مزگەوتدا بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد و لە جەژن و بۆنەکاندا لەگەڵ موسڵماناندا دەبوو، ئەو ئازیزەمان لە کۆتاییدا بەدەستی کەسێکی ناپاکی فارس شەهید کرا، ئەویش بەو جۆرە بوو، کەسێکی فارس کە لە ناو (مدینة)دا سەرقاڵی ئیشکردن بوو، ناوی (فیروز) بوو، هاتە لای پێشەوا (عمر) و هەڕەشەی لێکرد، پێشەوا (عمر) گوێی پێ نەدا و نەیگرت.

ڕۆژێکیان کە پێشەوا (عمر) لە مزگەوتدا بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، ئەو کەسە ناپاکە بەپەلە چوو بەرەو ڕووی پێشەوا (عمر) و بە خەنجەر لێیدا، موسڵمانانیش بەپەلە گرتیان، پێشەوا (عمر) لەناو جێگەدا کەوت، کاتێک پزیشکیان هێنا بۆ لای، پزیشکەکە وتی: هیچ چارەسەری نییە و دەمرێت، بەڵام ئەو هیچ ترسی نەبوو، بەڵکو خۆی دڵنەوایی ژن و منداڵەکانی دەدایەوە و خۆشحاڵ بوو بەوەی بۆ لای خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر) و شەهیدەکانی تر دەگەڕێتەوە.

پێش ئەوەی ئەو ئازیزەمان شەهید ببێت، بڕیاریدا موسڵمانان

جێنشینێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن، تا لە دوای ئەو دەسەڵاتی خیلافەت بگرێتە دەست، ئەوەبوو ئەوانیش پێشەوا (عثمان بن عفان)یان هەڵبژارد.

پێشەوا (عمر) کەسێکی نارد بۆ لای (عائشة)ی دایکمان، تا مۆڵەتی لێ وەربگرێت لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر)دا لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردە بکرێت، ئەویش مۆڵەتی پێدا، بۆیە لە دوای شەهیدبوونی بردیان لەوێدا ئەسپەردەیان کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت سەرکردەی موسڵمانان ئاگاداری بارودۆخی ژیانی خەڵکی سادە و هەژار بێت، نەوەک خۆی هەموو شتێکی هەبێت و گوێ بە هەژاران نەدات، هەروەک دەبێت کەسی دەوڵەمەند ئاگاداری هەژاران و دراوسێکانی بێت، ئێمەش پێویستە بیرمان لەلای هاورێکانمان بێت و چیمان هەبوو ئەوانیشی تێدا بەشدار بکەین.

گەورەیی و ژیری و دەوڵەمەندی بە جل و بەرگی جوان و زۆر خواردن نییە، بەڵکو ئیمان دەبێتە هۆی ناوداری و گەورە بوونی کەسێک، وەک پێشەوا (عمر بن الخطاب).

ئەگەر فارسێک پێشەوا (عمر)ی شەهیدکرد، نابێ ڕقمان لە

هەموو فارسێک بێت، چونکە هەموو شوێنێک کەسی باش و خراپی تێدایە.

دەبێت بۆ هەر ئیشێک مۆڵەت لە کەسەکان وەربگرین، سەیر بکەن پێشەوا (عمر) کە سەرکردەیە مۆڵەت لە (عائشة)(ڕەزای خوای لێبێت) وەردەگرێت، تا لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەی بکەن.

ڕاوێژکردن کارێکی گرنگی ئایینییە کە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بە جێیان گەیاندووە.

دەبێت زۆر بیرمان لای ئەوە بێت ئایینی ئیسلام بە هەموو شوێنێک بگەیەنین وەک پێشەوا (عمر) لە بیریدا بوو، هەروەها هەوڵی ئازادکردنی (قدس)ی پیرۆز و هەر ناوچەیەکی داگیرکراوی موسڵمانان بدەین.

## پرسیارەکان

- دەتوانیت باسی دایک و باوکی (عمر) بکەیت؟
- ناوی دایک و باوکی (عمر) و خوشکی (عمر) چی بوو؟
- (عمر) لە پێش ئیسلام ژیانی چۆن دەبردە سەر؟
- ئایا (عمر) بەرانبەر بە موسڵمانان کەسێکی توندوتیژ بوو؟
- باسی شێوەی موسڵمان بوونی پێشەوا (عمر) بکە؟
- خوای گەورە لە جەنگی بەدردا پشتگیری ڕای کێی کرد؟

پێشەوا (أبوبکر). پێشەوا (علي). پێشەوا (عمر).

- باسی هەڵوێستی پێشەوا (عمر) لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بکە.
- پێشەوا (أبوبکر) چۆن لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا (عمر)ی هێمن کردەوە؟
- پێشەوا (عمر) چ ڕۆلێکی لە هەڵبژاردنی پێشەوا (أبوبکر) بە خەلیفە هەبوو؟

- پێشەوا (عمر) چۆن بوو بە خەلیفە؟

بە جەنگ و بە زۆر. خەلیفە (أبوبکر) وەسییەتی کرد. موسڵمانان دایاننا.

- بە خاڵ کارەکانی پێشەوا (عمر) لە سەردەمی دەسەڵاتیدا بژمێرە.
- ئایا پێشەوا (عمر) موژدەی بەهەشتی پێ درابوو؟
- باسی دڵسۆزی پێشەوا (عمر) بۆ خەڵکی ژێر دەسەڵاتی بکە؟
- پێشەوا (عمر) چۆن و بە دەستی کێ کوژرا؟
- پێشەوا (عمر) خەلیفەی بۆ دوای خۆی دەستنیشان کرد؟ چۆن ئەوەی کرد؟

## ٣- (عثمان بن عفان)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) (عثمان بن عفان) بوو کە ئەویش خەڵکی (مکة) و کەسێکی لەسەرخۆ و بەڕێز بوو، پێشەوا (عثمان) یەکێ بوو لەو کەسانەی کە زۆر بە زوویی موسڵمان بوو، کاتێک دەنگی زوڵاڵی ئیسلامی پێگەیشت، پێشەوا (عثمان) ئامادەبوو لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا هەرچییەک بکات، تەنانەت گیانی خۆیشی بەخت بکات، ئەو ماڵ و سامانێکی زۆری خۆی کردە خەڵاتی ئایینی ئیسلام، هێندە بەڕێز بوو کە فریشتەکانی خوا شەرمیان لێدەکرد.

پێغەمبەر(ﷺ)یش دوو کچی خۆی پێشکەشی پێشەوا (عثمان) کرد، بەمەش دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ)هاوسەری پێشەوا (عثمان) بوون، یەکەمجار کە یەکێکیان مرد، پێغەمبەر(ﷺ)کچی دووەمی خۆی پێدا.

بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی بەهەشت و شەهیدی بە پێشەوا

(عثمان) بەخشی، لەسەردەمی پێشەوا (أبوبکر) و (عمر)یشدا کەسێکی بەڕێز و چاکەکار بوو، لە دوای شەهید بوونی پێشەوا (عمر بن الخطاب)، موسڵمانان پێشەوا (عثمان)یان بە (خەلیفە) جێنشین هەڵبژارد و هەموویان بەیعەتیان پێدا.

**لەدایکبوونی پێشەوا (عثمان)(رضي الله عنه):**

لە شاری (مکة)ی وشک و برنگدا شەش ساڵ لە دوای لە دایکبوونی (محمد بن عبدالله) و لە ڕۆژێکی گەرمدا منداڵێکی جوانکیلە لە دایکبوو کە ناوی (عثمان) بوو، ئەو منداڵە دایک و باوکێکی بێباوەڕی هەبوو، ئەوان بتیان دەپەرست و وەک خەڵکی تری شاری (مکة) لە بێباوەڕیدا ژیانیان دەبردەسەر.

ناوی باوکی (عفان) بوو، ناوی دایکیشی (أروی بنت کریز) بوو، (عثمان) لە باپیرە گەورەیەوە دەگەیشتەوە بە باپیرەی پێغەمبەر(ﷺ)، واتە خزمایەتی لە نێوان پێشەوا (عثمان) و پێغەمبەر(ﷺ)دا هەبوو، خەڵکی پێیان دەوت (أبو عمر)، بەڵام دواتر کەموسڵمان بوو پێیان دەوت (ذوالنورین)، واتە خاوەن دوو ڕوناکییەکە.

پرسیار: بۆچی بە پێشەوا (عثمان)یان دەوت (ذوالنورین)؟

وەڵام: لەبەرئەوەی پێشەوا (عثمان بن عفان) دوو جار داوای کچی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەرجارەو کچێکی خۆی پێدا، بەمە دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ) خێزانی ئەو بوون کە وەک ڕووناکی وابوون، هەروەها لەبەرئەوەی پێشەوا (عثمان) شەونوێژ و پەرستشی شەو و ڕۆژی زۆر بوو، هەم قورئانی دەخوێند و هەم شەو نوێژی دەکرد.

**ژیانی پێشەوا (عثمان)(ﷺ) پێش موسڵمانبوونی:**

پێشەوا (عثمان) هەر لە منداڵیەوە کۆمەڵێک ڕەفتاری جوان و ڕێک و پێکی هەبوو، ئەو هیچ کات ئامادە نەبوو شەراب (خمر) بخواتەوە و جنێو بدات و زینا بکات، بەڵکو پێی وابوو دەبێت مرۆڤەکان ئاکار و ڕەفتاریان جوان بێت، ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەنی (عثمان) زیادی دەکرد و خەڵکی (مكة)یش زۆر خۆشیان دەویست، هێندە خۆشیان دەویست ناوی لە هەموو شوێنێک باس دەکرا و هەمووان شەیدای بینین و هاودەمی ئەو بوون.

پێشەوا (عثمان) بەرەبەرە خۆی سەرقاڵی هەندێ ئیش وکار دەکرد، بەتایبەتی حەزی لە ئیشی بازرگانی دەکرد، بۆیە وەک بازرگانانی (مكة) کەوتە ئیشی بازرگانی، هێندە ڕەفتاری جوان

و دەستپاک بوو کە خەڵکی حەزیان دەکرد کاری بازرگانی لەگەڵ دا بکەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

منداڵ دەبێت هەمیشە خۆی لە تاوان و خراپەی کۆمەڵگە بپارێزێت، با خەڵکی کاری خراپە بکەن، ئێمە دەبێت وەک ئەوان نەکەین، چونکە خراپە ئیشی مرۆڤی ژیر و موسڵمان نییە.

دەبێت هێندە ڕەفتارمان جوان بێت کە سەرنجی هەرکەسێ بۆ لای خۆمان ڕابکێشین و هەموو کەس حەز بکات هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا بکات، نەوەک ڕەفتارمان ناشیرین و خراپ بێت و خەڵکی و کۆمەڵگە ڕقیان لێمان بێت.

کەسی موسڵمان دەبێت خۆی فێری ئیش و کاری حەڵاڵ و چاک بکات و بە تەمبەڵی دانەنیشێت.

**موسڵمانبوونی پێشەوا (عثمان)(ﷺ):**

جارێکیان پێشەوا (عثمان بن عفان) ویستی لەگەڵ بازرگانەکانی شاری (مکة) بۆ بازرگانیکردن بچێت بۆشام، هێشتا (محمد بن عبدالله) نەبووبوو بە پێغەمبەر، کاتێک (عثمان) چوو بۆ بازرگانییەکە و لەوێ کەوتەرێ، تا

بگەڕێتەوە، لە نیوەی ڕێگەدا لە شوێنێک لایاندا و شەو لەوێ مانەوە، تا کەمێک بحەسێنەوە، لەو شەوەدا کەسێک بە دەنگی بەرز لە ناویاندا هاواریکرد، ئەی خەڵکی (مکة) هەستن وا پێغەمبەرێک بە ناوی (احمد) لە (مکة)دا سەریهەڵدا، پێشەوا (عثمان)یش لەو قسەیە سەری سوڕما، ئایا دەبێت ئەو پێغەمبەرە کێ بێت لە (مکة)دا دەرکەوتبێت و ئەم نەیزانیبێت.

کاتێک گەڕایەوە بۆ (مکة)، بە دوای پێغەمبەردا دەگەڕدا، لەو ماوەیەدا پێشەوا (أبوبکر الصدیق) کە هاوڕێیەکی نزیک و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، سەردانی (عثمان)ی هاوڕێی خۆشەویستی خۆی کرد و لەوێ پێکەوە کەوتنە گفتوگۆکردن، پاش ماوەیەک (أبوبکر) باسی ئەوەی بۆ پێشەوا (عثمان) کرد کە (محمد)(ﷺ) بووە بە پێغەمبەری خوا، ئینجا پێشەوا (عثمان) و (أبوبکر) چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێشەوا (عثمان) لەوێ باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی (محمد بن عبدالله)(ﷺ)هێنا، دوایی بە وردی باسی ڕووداوەکەی ڕێگەی بازرگانییەکەی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)گێڕایەوە.

پرسیار: پێشەوا (عثمان) ناوی (احمد)ی بیست کە پێغەمبەر بێت، ئەی چۆن باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی (محمد)(ﷺ)هێنا؟

وەڵام: چونکە پێغەمبەری ئازیز چەند ناوێکی هەبوو کە

یەکێکیان (محمد)ە، یەکێکی تریشیان (احمد)ە، وەک لە پەیام و ئاییینەکـــانی پـــێش ئیسلامیشـــدا باســـی ئەوە کـــراوە کە پێغەمبەرێک بە ناوی (احمد) دێت کە کۆتا پێغەمبەرە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

خــــــوای گەورە نیشـــــــانی مرۆڤـــــــایەتی داوە کە(محمد)(ﷺ)پێغەمبەری خوا بێت، وەک چۆن ئەو کەسەی کە پێغەمـــبەر(ﷺ)ی نەدیبـــوو، کەچـــی لە نیـــوەی ڕێـــگەی بازرگانی خەڵکی (مكة)دا باسی پێغەمبەرایەتی (احمد) کرد.

دەبێت هەر شتێکی چاک هەبوو تەنها بۆ خۆمانمان نەوێت، بەڵکو هەوڵ بدەین هاوڕێکانیشمان لێی بێبەش نەبن، وەک چۆن پێشـەوا (أبـوبكر) کاتێـک خـۆی موسـڵمان بـوو، هەوڵیـدا هاوڕێکانیشی لەو ئایینە پیرۆزە بێبەش نەبن، بەتایبەت بەپەلە چوو بۆ لای پێشەوا (عثمان)، تا فێری بکات بازرگانی گەورەتر و چـاکتر باوەڕهێنـانە بە ئایینێـک کە هـۆی ڕزگـاربوون و سەرفرازی ڕۆژی دواییە.

هەر ڕووداوێکی سەر سوڕهێنەر ڕوویدا، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لای کەسی باوەڕدار و جێی متمانە و شارەزا.

**ژنهێنانی پێشەوا (عثمان)(رضي الله عنه):**

پێغەمـبەر(ﷺ) دوو کچـی بەناوی(رقيـة)و(أم كلثوم)هەبـوو، ئەو دوو کـچەی پێغەمـبەر(ﷺ) زۆر بەئاکـار و ڕێکوپێـک و جوان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو کچەی خۆی دابوو بە دوو

کوڕی (أبولهب)، ئەمەش لە پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، چونکە ئەوان خزمایەتییان لەگەڵ یەکدا هەبوو، پێشەوا (عثمان) زۆر حەزی دەکرد (رقیة) بە هاوسەر بگرێت، بەڵام تازە لە دەستی دەرچوو بوو، کاتێک (محمد)(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا، (أبو لهب) و ژنەکەی کەوتنە دژایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها ئەوان بە کوڕەکانیان وت، تا کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ژنی ئەوان بوون تەڵاقیان بدەن، ئەوانیش (رقیة، أم کلثوم)یان تەڵاقدا.

پێشەوا (عثمان) بە خۆشحاڵییەوە بەپەلە چوو بۆ داوای (رقیة، پێغەمبەر(ﷺ)یش (رقیة)ی پێدا، بەمە پێشەوا (عثمان) بوو بە زاوای پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها دواتر کاتێک (رقیة) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) (أم کلثوم)یشی دا بە (عثمان بن عفان)، دواییش (أم کلثوم) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی، ئەگەر کچی سێیەمیشم هەبوایە کە شووی نەکردبێت دەمدا بە (عثمان)، چونکە بە ڕاستی (عثمان) کەسێکی زۆر ژیر و باوەڕدار و بەڕێز و بە شەرم و حەیایە.

لێرەدا ڕق وکینەی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ)مان بۆدەردەکەوێت کە چەند بەرانبەر بەو ئازیزەمان خراپ بوون، تا ئاستێک (أبولهب) کە مامی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، بە زۆر

کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بە کوڕەکانی تەڵاق دا، بەڵام خوای گەورە کەسی زۆر چاکتری پێبەخشین کە ئەویش پێشەوا (عثمان بن عفان) بوو.

### ژیانی پێشەوا (عثمان)(ﷺ) لە (مكة)دا:

پاش موسڵمان بوونی پێشەوا (عثمان) و چەند کەسێکی تر، هەریەک لە موسڵمانان تەواو ژیانیان گۆڕا بۆ ژیانێکی ئیماندارانەی دروست، (عثمان)یش لەو کاتە بە دواوە حەزی دەکرد هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دا بێت، ئەو ئیمانی لە هەموو شتێک لەلا گرنگتر بوو، بۆیە هەوڵی دەدا خەڵکی تریش لەو پەیامە پڕ بەرەکەتە بێبەش نەبێت و چەند کەسێکی بۆ ئایینی ئیسلام بانگ کرد، کاتێکیش خەڵکی بێباوەڕ بەم کارەیان زانی، توڕەبوون و ڕقیان لە پێشەوا (عثمان) کەوت، ئەوان، ئەمجارە بە چاوێکی دوژمنانەوە تەماشای پێشەوا (عثمان)یان دەکرد، لە کاتێکدا پێشەوا (عثمان) بە چاوێکی سۆز و میهرەبانییەوە سەیری ئەوانی دەکرد.

پێشەوا (عثمان) حەزی دەکرد ئەو خەڵکە موسڵمان ببن و لە ئاگری دۆزەخ دووربن و بچنە بەهەشت، بەڵام ئەوان حەزیان دەکرد پێشەوا (عثمان) واز لە ئیسلام بهێنێت، مامی پێشەوا

(عثمان) زۆر تورە بوو لە پێشەوا (عثمان)، بۆیە هەمیشە دەکەوتە ئازاردانی پێشەوا (عثمان)، تا واز لە ئایینی ئیسلام بهێنێت، ئەو پێشەوا (عثمان)ی بە پەت دەبەستەوە و لە ژێرەوە دار و دڕکی دەسووتاند، تا دووکەڵە ژەهراوییەکەی بچێت بە سەروچاوی پێشەوا (عثمان)دا و ئازاری بدات، ئینجا بە پێشەوا (عثمان)ی دەوت واز لە ئایینەکەی (محمد) بهێنە، بەڵام پێشەوا (عثمان) وازی نەدەهێنا.

پێشەوا (عثمان) هێندە خۆڕاگربوو، تا ئەوەی مامی لێی بێزاربوو و لە کۆتاییدا بەریدا و دەریکرد، بەوجۆرە پێشەوا (عثمان) لەناو ئازار و نارەحەتیدا ژیانی بەسەردەبرد و ئامادەبوو لە پێناو پاراستنی ئیمانەکەیدا نان و ئاو نەخوات، بەڵام لەگەڵ پێغەمبەری(ﷺ)بێت و ئایینی ئیسلام وەربگرێت، چونکە ئەو ئایینە ڕزگاربوونی ڕۆژی دوایی تێدایە، ئیدی ئازاری کەمی دنیا چییە، ئەگەر بەهەشتی ڕۆژی دوایی بە دوادا بێت.

**پەند و ئامۆژگاری:**

کاتێک ئایینی ئیسلام وەردەگرین، دەبێت تەنها ئامانجمان وەرگرتنی تەواو و جێبەجێ کردن و گەیاندنی ئەو ئایینە بێت، نەوەک بە شتی تر هەڵبخەڵەتێین.

لە پێناو ئیسلامدا هەر ئازار و ناڕەحەتییەک بچەژین شتێکی ئاساییە، چونکە ڕزگاری ڕۆژی دوایی لە دوایە، جگە لەوەش پێشەواکانی پێشوومان لە سەر ئیسلام و ڕاستی ئازاردراون.

## کۆچکردنی پێشەوا (عثمان) و (رقیة)ی خێزانی(ﷺ):

پاش ئەو هەموو ئازارەی کە موسڵمانان بەدەستی بێباوەڕانی قورەیشەوە چەشتیان، پێغەمبەر(ﷺ)ڕێگەی دا، تا هەندێک لە موسڵمانەکان کۆچ بکەن بۆ (حبشة) کە پاشایەکی دادپەروەر و چاکی تێدا بوو، پێشەوا (عثمان) و (رقیة)ش بڕیاریاندا کۆچ بکەن بۆ (حبشة) و خۆیان ئامادەکرد و کەوتنە ڕێ، پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای خێری بۆ کردن، تا خوای گەورە چاکە بهێنێتە ڕێیان.

پاش ماوەیەک هەواڵی ئەوە هات کە خەڵکی (مكة) باوەڕیان هێناوە و خەڵکەکەی چاک بوون، بۆیە پێشەوا (عثمان) و (رقیة)یش گەڕانەوە بۆ (مكة)، کەچی هەواڵەکە ڕاست نەبوو، بەڵکو پێشەوا (عثمان) دووبارە ئازار دەدرایەوە، بەڵام لەوێ هەر خۆی ڕاگرت، تا ئەو کاتەی بڕیاردرا موسڵمانەکان کۆچ بکەن بۆ شاری(يثرب)(مدينة).

ئەوجا پێشەوا (عثمان) و (رقية) کۆچیان کرد بۆ (مدينة)،

لەوێ چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)بوون، تا بە دیداری شاد ببنەوە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

پێویستە هەمیشە لەسەر ئایینەکەمان بەردەوام بین و واز نەهێنین، بەڵکو ئامادە بین لە پێناویدا هەر ناڕەحەتییەک بچەژین، تەنانەت ئەگەر ناچار کراین ئامادە بین ماڵ و خاکی خۆمان بەجێ بهێڵین.

زەوی هەمووی موڵکی خوایە، بۆیە لە هەر کوێ کەسی دادپەروەر هەبوو لەوێ بژی، بەڵام، ئەگەر لە وڵات و خاکی خۆتدا کەسی چاک هەبوو، دەبێت لە وڵاتی خۆتدا بژی.

زۆر جار هەواڵی درۆ و ناڕاست بڵاو دەبنەوە، دەبێت موسڵمان ورد بێتەوە و بزانێ هەواڵەکە ڕاستە یان نا.

## ژیانی پێشەوا (عثمان) (رضي الله عنه) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا:

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مدینة)، خۆشی وکامەرانی یەکپارچە شارەکەی گرتەوە، پێشەوا (عثمان)یش لەگەڵ موسڵمانانندا خۆشی و شادی دایگرتبوو کە پێغەمبەری خوا و باوکی خێزانەکەی دێت بۆ لایان، ئیتر تەمەنی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەبردەسەر، ئەو لە نوێژ و مزگەوت و

ژیانی تایبەت و جەنگدا هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مافی ماڵ و خێزانی خۆی دەدا.

پێشەوا (عثمان) هەردەم سامانی خۆی کردبوو بە قوربانی ڕێگەی ئیسلام و هەمیشە بەرانبەر بە موسڵمانان خێری دەکرد، بۆ نموونە: لە شاری (مدینة)دا کە ئاو زۆر نەبوو خەڵکی بیریان بەکاردەهێنا، یەکێک لە ناودارترین بیرەکانی (مدینة) هی کەسێکی جوولەکە بوو، موسڵمانانیش بە پارە ئاویان لێدەکڕی، ئەمەش وایدەکرد موسڵمانان بەشێکی زۆری ماڵ و سامانیان لەو پێناوەدا خەرج بکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) لەناو موسڵماناندا داوای کرد یەکێک ئەو بیرە بکڕێت و موسڵمانان ڕزگار بکات، پێشەوا (عثمان) لە شوێنی خۆی هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەیکڕم، ئینجا چوو بۆ لای جوولەکەکە و بیرەکەی بە نیوەیی لێکڕی، ڕۆژێک بۆ جوولەکەکە و ڕۆژێکیش بۆ پێشەوا (عثمان)، کاتێک جوولەکەکە زانی خەڵکی لەلای ئەو ئاو ناکڕن، چوو بۆ لای پێشەوا (عثمان) و نیوەکەی تریشی پێ فرۆشت، بەمجۆرە پێشەوا (عثمان) ئەو تینوێتییەی لە کۆڵی موسڵمانان کردەوە.

لە جەنگی بەدردا موسڵمانان بۆ جیهاد دەچوون، (رقیة) نەخۆش بوو، پێشەوا (عثمان) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و

داوای لێکرد ڕێگەی بدات، تا لای (رقیة) بمێنێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕێگەی پێدا، لێرەوە دەبینین پێشەوا (عثمان) بەرانبەر بە ماڵ و خێزانەکەی چەندە بەسۆز و میهرەبان بووە.

موسڵمانان ڕۆژانە سەردانی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەکرد، ڕۆژێکیان پێشەوا (أبوبکر) چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش بەخێرهاتنی کرد، بەڵام لە شوێنی خۆیدا هەڵنەسایەوە، دواتر پێشەوا (عمر)یش هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەروەک جاری پێشووی کرد، کاتێک پێشەوا (عثمان) هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو یەکسەر جلوبەرگی خۆی توندوتۆڵ کردەوە و لە ڕوویدا هەستایەوە، (عائشة)ی دایکمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی بۆ پێشەوا (أبوبکر) و (عمر) هەڵنەستایتەوە و خۆت نەگۆڕی، کەچی بۆ پێشەوا (عثمان) واتکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (يا عائشة الا استحيي من رجل والله ان الملائكة لتستحيي منه) واتە: (عائشة) ئایا شەرم لە کەسێک نەکەم کە سوێند بە خوا فریشتەکانی خوا شەرمی لێدەکەن، مەبەستی پێشەوا (عثمان) بوو.

لەجەنگی تەبووکدا موسڵمانان بێ چەک بوون و دەبوایە چەک و سوارە ئامادەبکەن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی پێشکەشکرد و موسڵمانانی هاندا، تا خێر و چاکە بکەن و پارە

کۆبکەنەوە، ئیتر هەر موسڵمانێک و بەشێکی پارە و سامانی خۆی دەهێنا، پێشەوا (عمر) نیوەی ماڵەکەی هێنا، پێشەوا (عثمان)یش زۆرترین بەشی ماڵەکەی هێنا کە سێ هەزار وشتر و کەلوپەلی تەواوبوو، پێغەمبەر(ﷺ)یش هەمیشە دوعای خێری بۆ پێشەوا (عثمان) دەکرد و دەپاڕایەوە لە خوا کە لە پێشەوا (عثمان) ڕازیبێت.

بەمجۆرە پێشەوا (عثمان) بەردەوام لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا بوو.

لە ڕێککەوتنی حودەیبیەیشدا پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا (عثمان)ی بە نوێنەر نارد بۆ لای قورەیشییەکان، هەواڵ بڵاوبوویەوە کە بێباوەڕەکان پێشەوا (عثمان)یان کوشتووە، پێغەمبەر(ﷺ)یش یەکسەر بەیعەتی لە موسڵمانان وەرگرت، تا تۆڵەی خوێنی پێشەوا (عثمان) بسەنێتەوە، خۆیشی بە دەستەکەی تری لە جیاتی پێشەوا (عثمان) بەیعەتیدا، بەڵام دوایی دەرکەوت هەواڵەکە ڕاست نەبووە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

خۆشترین شت لەلای هاوەڵان ئەوەبووە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا ژیان ببەنە سەر. ئێمەش، دەبێت لەگەڵ فەرموودەکانی و ژیانیدا بژین.

چەندە ماڵ و سامان لە ڕێگەی خوادا ببەخشین، هێندە زیاتر خێرمان دەگات و خوای گەورە لێمان ڕازی دەبێت.

چاودێری کردنی نەخۆش و چاکەکردن لەگەڵیدا پێویستە، وەک چۆن پێشەوا (عثمان) چاودێری (رقیة)ی دەکرد.

پێویستە تا بتوانین بە شەرم و حەیاوە لەگەڵ ژیانی پێشەوا (عثمان)دا هەڵسوکەوت بکەین، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و فریشتەکان شەرمیان لێکردووە.

**پێشەوا (عثمان)(رضي الله عنه) لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا(ﷺ):**

لەساڵی یازدەی کۆچی لە شاری (مدینة)دا هەواڵی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بڵاوبوویەوە، موسڵمانان غەمبار و بێزاربوون، بەتایبەتی پێشەوا (عثمان) کە دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ)ی خواستبوو و زاوای پێغەمبەری خوا(ﷺ)بوو،

جگە لەوەی ماوەیەکی زۆری ژیانی لەگەڵ ئەودا بەسەر بردبوو، هەروەها یەکێک بوو لەوکەسانەی یەکەمجار باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئازیز هێنا، بۆیە بە هەواڵی نەخۆشکەوتنی ئەو ئازیزە زۆر غەمبار و دڵگران بوو.

پێشەوا (عثمان) هەردەم دەچوو سەردانی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد و لەگەڵیدا بوو، ئەو حەزی نەدەکرد تەنها ساتێکیش بەجێی بهێڵێت، زۆر پێغەمبەری خوای خۆش دەویست، تا ئەوەی لە ڕۆژی دوازدەیی (ربیع الاول) ساڵی یازدەی کۆچیدا هەواڵێک کەوتە بەر گوێی پێشەوا (عثمان بن عفان) کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە و ماڵئاوایی لە ژیان کردووە، ئیتر پێشەوا (عثمان) یەکپارچە ژیانی بوویە ئازار و تاڵی و خەفەت و نەیدەزانی چی بکات، تا ئەوەی خوای گەورە خۆڕاگری پێبەخشی و بە ناچاری دانی بەو ئازارەدا نا.

## پێشەوا (عثمان) لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا (أبوبكر) و (عمر)دا(رضي الله عنهما):

پێشەوا (عثمان) پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)ژیانی لە (مدينة)دا دەبردەسەر، سەرکردەی موسڵمانانیش پێشەوا (أبوبكر الصديق)بوو، دوای ئەویش پێشەوا (عمر بن الخطاب)هات.

پێشەوا (عثمان) لە سەردەمی ئەواندا گوێڕایەڵی تەواوی

سەرکردەی موسڵمانان بوو، هەر فەرمانێک لە خەلیفەوە دەربچوایە ئەو یەکسەر جێبەجێی دەکرد، جگە لەوەی لە کاتی هەڵبژاردنی خەلیفەدا ئەو هیچ لاسارییەکی نەبوو و بە خۆشحاڵییەوە بەیعەتی پێدەدا، ئەوانیش لەکاتی بڕیارداندا پرس و ڕاوێژیان پێ دەکرد.

پێشەوا (عثمان) لە نوێژ و جەماعەتەکاندا ئامادە دەبوو، ڕۆژێکیان لە نوێژی هەینی دواکەوت، تا ئەوەی سەرکردەی موسڵمانان پێی ڕاگەیاند جارێکی تر زووتر بێت، ئەو کەسێکی زۆر بە شەرم و حەیا بوو، هەموو موسڵمانان شەرمیان لێ دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا تەمبەڵی نەدەنواند، بەڵکو خۆی سەرقاڵی ئیشەکەی جارانی خۆی دەکرد کە ئیشی بازرگانی بوو، لە قازانجەکەشیدا بەشێکی زۆری بەسەر موسڵماناندا دابەش دەکرد.

جارێکیان پێشەوا (عثمان) چوو بۆ بازرگانی و شمەکێکی زۆر چاکی هێنایەوە، هەژاری و نەبوونی لە شاردا بڵاو بووبوویەوە، کۆمەڵێک کەس هاتن داوایان کرد هەموو شتەکانیان پێ بفرۆشێت بۆ ئەوەی دوایی ئەوانیش بیفرۆشنەوە و قازانجی تێدا بکەن، بەڵام پێشەوا (عثمان) فەرمووی ئەو پارەیە کەمە و کەسێک هەیە زیاترم پێدەدات، ئەوانیش وتیان: کێ

هەیە لە ئێمە زیاترت پێ بدات، خۆ ئێمە یەکەم کەسین هاتوین بۆ لای تۆ و ئەو هەموو پارەیەمان پێداویت؟! ئەویش وتی: خوای گەورە دە بەرانبەر پارەی پێداوم، ئیتر چۆن دەیدەم بەو پارە کەمەی ئێوە، بۆیە بڕیاری دا بیکات بە خێر و دابەشی بکات بەسەر موسڵماناندا.

پێشەوا (عثمان) لە ماوەی دەسەڵاتی ئەو دوو جێنشینەدا لە هەر بوارێکی ژیاندا ڕەحمەتێکی خوایی بوو بۆ موسڵمانان، بە جۆرێک هەموان پێی دڵخۆش بوون و لێی سوودمەند بوون.

## پێشەوا (عثمان)(ﷺ) دەبێتە جێنشین:

پێش ئەوەی پێشەوا (عمر) ژیانی دونیا بەجێبهێڵێت و لەو کاتەی بریندار بوو، بڕیاریدا کەسێک وەک جێنشین لە دوای خۆی دابنێت، تا موسڵمانان گیرۆدە نەبن و تووشی کێشە نەبن، بۆیە دەستەیەکی لە شەش کەس لە گەورە زانا و ناودارانی ئیسلام پێکهێنا و بڕیاریدا یەکێکیان وەک جێنشینی موسڵمانان هەڵبژێرن، پاش ماوەیەک بڕیار درا پێشەوا (عثمان) لە دوای پێشەوا (عمر) ببێت بە جێنشینی موسڵمانان.

بۆیە کاتێک پێشەوا (عمر بن الخطاب)کۆچی دوایی کرد، پێشەوا (عثمان) چوویە شوێنەکەی ئەو، موسڵمانانیش دەستە بە دەستە بەیعەتیان پێدا.

## سەردەمی جێنشینی پێشەوا (عثمان)(رضي الله عنه):

ڕۆژێکی غەمبار لە شاری (مدینة)دا ڕوویکردە موسڵمانان، سەرکردەی خۆشەویستمان پێشەوا (عمر بن الخطاب)، کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ماڵئاوایی یەکجارەکی لە موسڵمانان کرد، لەگەڵ گریان و غەمباریدا موسڵمانان دەچوون، تا بەیعەت بە خۆشەویستێکی تری پێغەمبەر(ﷺ)بدەن کە ئەویش پێشەوا (عثمان بن عفان) بوو، بەو جۆرە پێشەوا (عثمان بن عفان) بە هەڵبژاردنی لەلایەن موسڵمانانەوە بوو بە جێنشینی سێیەمی پێغەمبەر(ﷺ).

پێشەوا (عثمان) لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا زۆر بە وردی و دڵسۆزییەوە ئیشی دەکرد، لە ماڵ و سامانی تایبەتی خۆی پارەیەکی زۆری لە پێناوی خوای گەورەدا دەبەخشی، تا موسڵمانان بحەسێنەوە، پێشەوا (عثمان) لەگەڵ خەڵکیدا زۆر لەسەرخۆ و نەرم و نیان بوو، هەرچەندە بە تەمەن بوو، بەڵام خۆیشی ئیشی دەکرد.

پێشەوا (عثمان) کەسێکی هەبوو کە ئیشی بۆ دەکرد، بەڵام خۆیشی یارمەتی دەدا و نەیدەهێشت تەنها ئەو ئیش بکات، لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا نەبوونی و هەژاری تەواو کەم بوویەوە، چونکە پێشەوا (عثمان) وەک دوو جێنشینەکەی تر زۆر دادوەر و لەسەرخۆ و چاکەخواز بوو.

پێشەوا (عثمان) نان و خۆراکی ئەو خەڵکەی دابین دەکرد و دژی برسێتی و نەبوونی بوو، لە سەردەمی دەسەلاتی خۆیدا چەند کارێکی گرنگی ئەنجامدا کە مایەی سوودێکی زۆر بوون بۆ هەموو موسڵمانان، ئەو کارانەش ئەمانەبوون:

**یەکەم/ کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:** لەبەر ئەوەی لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا خەڵکێکی زۆری شوێنە جیاوازەکان موسڵمان بووبوون، هەریەکە و بەجۆرێ قورئانیان دەخوێندەوە، ئەمەیش وایکرد هەندێک بە شێوەی هەڵە قورئان بخوێننەوە، بەڵام پێشەوا (عثمان) ئامادە نەبوو بەو جۆرە بێت، بۆیە بڕیاریدا قورئان بە یەک جۆر بنووسێتەوە، تا موسڵمانان بە یەک جۆر بیخوێننەوە، بۆ ئەمەش ئەم ئیشەی ڕاسپارد بە (زید بن ثابت) کە لە سەردەمی پێشەوا (أبوبکر)دا کۆی کردبویەوە، تا ئەم جارەیان قورئان بە یەک شێوە بنووسێتەوە.

کاتێک ئیشەکە تەواو بوو، پێشەوا (عثمان) چەند دانەیەکی لەسەر نووسیەوە و هەر دانەیەکی نارد بۆ ناوچەیەک و ئەوانی تریشی لەناوبرد، بەمجۆرە موسڵمانان لەسەر یەک شێوە قورئانیان دەخوێند، تا ئەمڕۆش کە ئێمە قورئان دەخوێنین لەسەر ئەو قورئانەی پێشەوا (عثمان) دەیخوێنین.

**دووەم/** پێشەوا (عثمان) هەوڵیدا ناوچە و وڵاتە بێباوەڕکان

ئازاد بکات و ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت، تا ئەوانیش لە پەیامی خوای گەورە بێبەش نەبن.

**سێیەم/** پێشەوا (عثمان) بۆ یەکەمجار کەشتی جەنگی بۆ لێدانی دوژمنانی ئیسلام بەکارهێنا، چونکە جاران ئەو کەشتییە لەناو موسڵماناندا بەکارنەدەهێنرا، ئەو جۆرە کەشتییانە سوودێکی زۆریان هەبوو بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر بێباوەڕاندا، خوای گەورە پاداشتی چاکەی پێشەوا (عثمان) بداتەوە.

**چوارەم/** هەروەها پێشەوا (عثمان) لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا مووچەی بۆ هەندێ کەس بڕیەوە کە جاران مووچەیان نەبوو، هەروەها هەندێک لەو کەسانەی لابرد کە دەسەڵاتیان هەبوو و کەسانی تری لە شوێنیاندا دانا، بەمجۆرە پێشەوا (عثمان) هەوڵیدا ژیانی موسڵمانان خۆش بکات، کەچی کەسانێکی خراپ و لاسار لە سەردەمی ئەودا سەریان هەڵدا کەدژی موسڵمانان بوون و کەوتنە درۆکردن لە ڕووی پێشەوا (عثمان)دا و قسەیان پێدەوت، تا لە کۆتاییدا بڕیاریاندا بیکوژن.

## پەند و ئامۆژگاری:

هەرکەس ئیشێکی بەدەست بوو، دەبێت هەوڵبدات بە جوانترین شێوە ئەنجامی بدات، وەک چۆن پێشەوا (عثمان) هەوڵیدا ئیشەکانی بە چاکی ئەنجام بدات، تا دەتوانین لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا بژین.

هەوڵ بدەین، تا دەتوانین خۆمان ئیشەکانی خۆمان بکەین، ئەگەریش کەسێک یارمەتی داین نابێت ئێمە تەمبەڵ بین.

## شەهید بوونی پێشەوا (عثمان)(ﷺ):

ناحەزانێکی زۆر لە ناو شاری (مدینة)دا بڵاوبووبوونەوە، هەندێک لەوانە دوژمنایەتییەکی توندیان لەگەڵ موسڵماناندا هەبوو، چونکە ئەوان حەزیان لە ئیسلام نەبوو و دەیانویست لە وڵاتێکی بێباوەڕیدا بژین.

یەکێک لەوانە ناوی (عبدالله بن سبأ) بوو، ئەو کەسێکی لە بنەڕەتدا جوولەکە بوو، ڕقێکی زۆری لە موسڵمانان بوو، (عبدالله) لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا کەوتە درۆ هەڵبەستن بەرانبەر بە پێشەوا (عثمان)، ئەو دەیوت: (عثمان) تەنها خزم و کەسوکاری خۆی دەوێت و هەرچی پارەی هەیە دەیدات بە ئەوان و ڕقی لە خەڵکی ترە، ئەمەش درۆیەکی گەورەبوو، چونکە

پێشەوا (عثمان) لە پێشتریشدا پارەی خۆی دەکردە خەڵاتی ڕێگەی خوا، تا هەموان پێی بحەسێنەوە، کەچی بەرەبەرە ئەو هەواڵە ناڕاستە لە ناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە و کۆمەڵێک دروست بوون کەپ ێیان دەوترا سەبەئییەکان، ئەوان بڕیاریاندا پێشەوا (عثمان) شەهید بکەن، بۆیە هەموویان گەمارۆی ماڵەکەی پێشەوا (عثمان)یان دا و نەیانهێشت بۆ ماوەیەک نان و ئاوی بۆ بڕوات.

بەڵێ، ئەو پێشەوا (عثمان)ەی پێشتر بە پارە و ماڵی خۆی خەڵکی لە تینوێتی و برسیەتی ڕزگار دەکرد، ئەوەتا لەلایەن چەند ناحەزێکەوە ستەمی لێدەکرێت و ناهێڵن نان و ئاوی بۆ بچێت، بەڵام پێشەوا (عثمان) گوێی بەوە نەدا و بڕیاری دا کۆتا ساتەکانی تەمەنی خۆی لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا بباتە سەر، بۆیە لە قورئان خوێندنەکەی بەردەوام بوو، تا ئەوەی لە کتوپڕێکدا ناحەزانی ئیسلام دایان بە سەریدا و لە کاتی خوێندنی قورئاندا شەهیدیان کرد.

ئەمەش موسڵمانانی تەواو بێزار و دڵگران کرد، چونکە موسڵمانەکان زۆرێکیان لە دەرەوەی شارەوە بوون و بەڕێکەوتبوون، تا بێن بۆ ڕزگارکردنی پێشەوا (عثمان)، بەڵام فریا نەکەوتن، ئەوانەی (مکة)ش کەم و بێ دەسەڵات بوون.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- ناحەزان و دوژمنانی ئیسلام هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن زیان بە موسڵمانان بگەیەنن، بۆیە دەبێت موسڵمانان زۆر وریا و ئاگاداریان بن و خۆیان لە زیانیان بپارێزن.

٢- دەبێت چاوەڕێی پاداشت لە خوای گەورە بکەین، نەوەک خەڵکی تر، چونکە زۆر کەس هەن، دەبێت چاکەیان لەگەڵ دا بکەین، ئەوان خراپە و لاسار دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا کەسانی تری وا هەن زۆر چاکن و سوپاسی کارەکەمان دەکەن.

٣- دەبێت ئێمەش وەک پێشەوا (عثمان) ژیانمان لە خزمەتی قورئاندا ببەینە سەر و لەو پێناوەشدا گیانمان بەخت بکەین.

٤- خۆشەویستیمان بۆ پێشەوا (عثمان) زیاد دەکات، کاتێک دەبینین ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و یاران و قورئانی پیرۆزدا بردەسەر، تا شەهید بوو.

**پرسیارەکان:**

١- باسی لە دایکبوونی پێشەوا (عثمان) بکە و ناوی دایک و باوکی چی بوو؟

٢- پێشەوا (عثمان) لە تەمەنی منداڵی و سەرەتای ژیانیدا ڕەفتاری چۆن بوو؟

٣- دەتوانین بڵێیت پێشەوا (عثمان) چۆن موسڵمان بوو؟

٤- کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، پێشەوا (عثمان) چی کرد؟

٥- بۆچی پێشەوا (عثمان) لە جەنگی بەدردا بەشداری نەکرد؟

٦- چ پەند و ئامۆژگارییەک لە بەخششی پێشەوا (عثمان)دا وەردەگرین؟

٧- پێشەوا (عثمان) چۆن بوو بە جێنشین؟

٨- باسی کۆچی پێشەوا (عثمان) بۆ (حبشة) بکە؟

٩- چی پەند و ئامۆژگارییەک لە ئازارادنی پێشەوا (عثمان) لە (مکة)دا وەردەگریت؟

١٠- کێ بووە هۆکاری سەرەکی شەهیدبوونی پێشەوا (عثمان بن عفان)؟

١١- بۆچی بە پێشەوا (عثمان)یان دەوت (ذوالنورین)خاوەنی دوو ڕووناکییەکە؟

١٢- تۆ چەندە پێشەوا (عثمان)ت خۆش دەوێت؟ ئەگەر لە سەردەمی ئەودا بوویتایە چیت دەکرد؟

## ٤- (علي بن أبي طاليب)(رضي الله عنه)

**ناساندن:**

ناوی (علي بن أبي طاليب)ە و ئامۆزای پێغەمبەرە(ﷺ)، لە شاری (مكة) لە دایک بووە، یەکەم منداڵی موسڵمان و زاوای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوسەری (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و باوکی (حسن) و (حسين)بووە، لە دوای پێشەوا (عثمان) بووە بە سەرکردەی موسڵمانان و لە کۆتاییدا شەهید بووە.

**لە دایکبوونی پێشەوا (علي)(رضي الله عنه):**

پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری (مكة)دا بوو و تەمەنی سی ساڵ بوو، پێنج ساڵ بوو ژنی هێنابوو، لە ناو گەرما و قەرەباڵغی شاری (مكة)دا منداڵێک بە ناوی (علي بن أبي طاليب) لە دایکبوو، کە ئەویش پێشەوا (علي بن أبي طاليب) بوو، (أبوطاليب) لە شاری (مكة)دا ناودار بوو، ئەو دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو، بەڵام پارە و سامانی زۆر نەبوو، بەتایبەت (أبوطاليب) چوو بوو بە تەمەندا و پیر بووبوو.

## ژیانی منداڵی پێشەوا (علي)(رضي الله عنه):

پێشەوا (علي) هەر لە منداڵییەوە کەسێکی ژیر و پاک و خاوێن و ڕێکوپێک بوو، ئەو هەرگیز بتەکانی خۆش نەدەویست وکڕنوشی بۆ نەدەبردن، بەڵکو گاڵتەی بەوە دەهات مرۆڤ شتی وەکوو خۆی، یان لە خۆی بچووکتر بپەرستێت، ئەو پێی وابوو چۆن مرۆڤ دەبێت کڕنووش بۆ بتێک ببات کە لە دار و بەرد دروستکراوە، هەروەها ئەو عارەقی نەدەخواردەوە و خۆی لە قسەی ناشیرین دەپاراست، باوکی پێشەوا (علي) پیر بووبوو و توانای ئەوەی نەبوو بە باشی سەرپەرشتی منداڵەکانی بکات، بۆیە برا و خزمەکانی بڕیاریاندا هەریەکە و یەکێک لە منداڵەکانی ببەن بۆ لای خۆیان، ئەوەبوو پێغەمبەری ئازیز پێشەوا (علي) برد بۆ لای خۆی، تا پەروەردەی بکات و پێی بگەیەنێت و سەرپەرشتیاری بکات.

پێشەوا (علي) لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و (خدیجة)دا ژیانی منداڵی دەبردەسەر، ئەو هەر لەو کاتەوە فێری ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانی ژیان بوو، فێری ئەوەبوو کە ژیان بۆ ئەوە نییە مرۆڤ تیایدا کاری خراپە ئەنجام بدات، بەڵکو کاری خراپ بۆ هەموان مایەی ناخۆشییە.

کاتێک خوای گەورە پەیامی ئیسلامی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)نارد، پێشەوا (علي) یەکێک بوو لەو کەسانەی کە زۆر زوو باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا، چونکە ئەو دەیزانی کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندە ڕاستگۆ و چاکەکارە، بەو جۆرە پێشەوا (علي) هەر لە منداڵییەوە بە باوەڕداری ژیانی بردەسەر، پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا (علي) بێ ناز نەدەکرد و وەک منداڵی خۆی هەموو خزمەتێکی دەکرد و دڵی خۆش دەکرد و پەرەوەردەی دەکرد.

پرسیار: ناوی خوشک و براکانی پێشەوا (علي) چی بوون؟

وەڵام: ناوی براکانی پێشەوا (علي) بریتی بوون لە: (طالیب)، (عقیل)، (جعفر) ، هەروەها ناوی خوشکەکانیشی بریتی بوون لە (أم هانئ)، (جمانة).

## موسڵمانبوونی پێشەوا (علي)(رضي الله عنه):

ڕۆژێکیان پێشەوا (علي) هات بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ) و (خديجة) نوێژ دەکەن، پێشەوا (علي) سەری سوڕما، چونکە جارانی پێشتر شتی وای نەبینی بوو، بۆیە وەستا، تا نوێژەکەیان تەواو کرد، دواتر چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: ئەو کارە چی بوو ئێوە ئەنجامتان

دەدا؟ پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرمووی: (دين الله اصطفاه لنفسه و بعث به رسله، فادعوك الىٰ الله وحده و الىٰ عبادته و تكفر باللات والعزىٰ).

واتە: (ئەمە پەیـام و ئـایینی خـوای گەورەیە کە خـۆی هەڵیبـژاردووە و پێغەمبەرانـی ناردووە، تـا بـیگەیەنن بە خەڵـک، منـیش داوات لێـدەکەم بـاوەڕ بەخـوا بهێنیـت و بتەکـانی لات و عوززا بە درۆ و ناڕاست بزانیت، بەڵام (علي) سەری سوڕما و وتی: دەبێت بڕۆم باسی بکەم بۆ باوکم، ئەگەر ڕازی بوو، ئینجا بـاوەڕ دێـنم، پێغەمـبەر(ﷺ) حەزی نەکـرد پێشـەوا (علـي) ئەوە بگێـڕێتەوە و فەرمـووی: (يـا علـي اذا لـم تسـلم فـاكتم) واتە: ((علي)، ئەگەر موسڵمان نابیت، ئەمە لای کەس باس مەکە).

پێشــەوا (علــي) ئەو شــەوە بەردەوام بیــری لە قســەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دەکردەوە و دەیویست بزانێت موسڵمان بێت باشە، یان هەر وەک جاران بێت، بەڵام لە درەنگە شەودا خوای گەورە دڵـی پێشـەوا (علي) نەرم کـرد، پێشـەوا (علـي) بڕیاریـدا بەبـێ ئەوەی بە باوکی بڵێت موسڵمان بێت.

بەیانی بە پەلە چووە خزمەتی پێغەمـبەر(ﷺ) و بـاوەڕی هێنـا و موسـڵمان بـوو، بەڵام پێشــەوا (علـي) نەیدەهێشـت بـاوکی بە موســـڵمان بـــوونی بزانێـــت، بەڵکـــو هەر بە نهێنــــی لەگەڵ

پێغەمبەر(ﷺ)دا نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند و فێری زانیارییەکانی ئیسلام دەبوو.

بەڵام ڕۆژێکیان (أبو طالیب) پێغەمبەر(ﷺ) و پێشەوا (علي) بینی نوێژیان دەکرد، (أبو طالیب) بە محمد(ﷺ)ی وت: برازای خۆشەویستم ئەوە چی دەکەن؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مامە گیان ئەمە ئایینی خوا و فریشتەکانی خوا و پێغەمبەرەکانی خوا و ئیبراهیمی باپیرمانە).

بەڵام (أبو طالیب) موسڵمان نەبوو و وتی: برازای خۆشەویستم من ناتوانم واز لە ئایینی باو باپیرانی خۆم بهێنم، بەڵام بەڵێنی پێدا کە تا ماوە پاڵپشتی بکات و نەهێڵێت ئازار بدرێت، چونکە ئەو دەیزانی کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندە ڕاستگۆ و بە ڕەوشتە، پێشەوا (علي) لەو ماوەیەدا بۆ بانگەواز کردن بۆ ئایینی خوا یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەدا و خۆی فێری زانیارییەکانی ئیسلام دەکرد و بۆ هەموو شوێنێک لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دەچوو و بەجێی نەدەهێشت.

پێغەمبەر(ﷺ)یش پێشەوا (علي) زۆر خۆشدەویست و گرنگییەکی زۆری پێدەدا، تەنانەت ئەو ڕۆژەی (أبو طالیب) ی باوکی کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) نازی پێشەوا (علي) کێشا و دڵنەوایی دایەوە و داوای لە پێشەوا (علي) کرد کە باوکی بشوات و ئەسپەردەی بکات.

پێشەوا (علي) چەندین جار لە بانگەواز کردنیدا بۆ ئیسلام یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەدا، ئەوەتا (أبو ذر الغفاري) کاتێک دەیەوێت موسڵمان بێت پێشەوا (علي) بە لێزانانە دەیبات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەوێ (أبو ذر الغفاري) باوەڕ دەهێنێت، (أبو ذر الغفاري) هاتە ناو شاری (مكة) و بە دوای پێغەمبەر(ﷺ)دا دەگەڕا، پێشەوا (علي) کە زانی (أبو ذر الغفاري) کەس ناناسێت و بێگانەیە، میوانی کرد بۆ ماڵی خۆیان و لەوێ ماوەیەک لەلای بوو، دواتر کەزانی (أبو ذر الغفاري) دەیەوێت پێغەمبەر(ﷺ) ببینێت، داوای لە (أبو ذر الغفاري) کرد کە بە دوایدا بێت و کارێک نەکات کە بێباوەڕان پێی بزانن، بەو جۆرە پێشەوا (علي) (أبو ذر الغفاري)ی برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و (أبو ذر الغفاري) لەوێ موسڵمان بوو.

هەروەها کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ سەردانی هۆزەکان، تا ئایینی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت، پێشەوا (علي) لەگەڵ خۆیدا دەبرد، چونکە دڵنیابوو کە پێشەوا (علي) لەگەڵیدا ڕاستگۆیە و پاڵپشتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات، بەمجۆرە پێشەوا (علي) ژیانی منداڵی خۆی لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بردە سەر و فێری کۆمەڵێک شتی جوان و زانیاری ئیسلام بوو، لەوانە:

١- پێشەوا (علي) فێری ئەوەبوو کە تەنها یەک خوا هەیە و هیچ کەس نییە هێندەی خوای گەورە بەهێز بێت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ)یش بەندەیەکی خوایە.

٢- مرۆڤ بۆ ئەوە دروستکراوە کە پەرستشی خوای گەورە بکات، تا بچێتە بەهەشتی بەرین.

٣- دەبێت موسڵمان ڕەوشت و ئاکاری جوانی هەبێت و ببێتە نموونە بۆ هەموو خەڵکانی تر، تا بزانن ئایینی ئیسلام چەندە جوان و دروست و گەورەیە.

٤- پێشەوا (علي) فێری ئەوەبوو کە هەر موسڵمانێک ئایینی ئیسلامی وەرگرت، دەبێت جێبەجێی بکات و خەڵکی تریش فێر بکات و ئامادە بێت لە پێناو ئایینی ئیسلامدا ماڵ و گیانی خۆی بەخت بکات.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت یارمەتی خزم و کەس و کارە پیر و هەژارەکانمان بدەین، وەک چۆن پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ)یارمەتی (أبو طالیب)ی دا.

هەر کاتێک کەسێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز ڕەوشتێکی جوانی فێر کردین، پێویستە لێوەی فێر بین و سوپاسی بکەین.

موسڵمانی ژیر و وریا ئەو کەسەیە کە کاتێک خۆی فێری شتێکی جوان و چاک بوو، هەوڵبدات خەڵکی تریش فێر بکات، تا هەموان سوودی لێ وەرگرن.

کاتێک کەسێک پێی وتین، دەبێت شتێک بە نهێنی بپارێزین و لای هیچ کەس باسی نەکەین، نابێ بڕۆین بیگێڕینەوە بۆ خەڵک، چونکە ئەوە لە ئیسلامدا تاوانە.

دەبێت ئێمەش وەک پێشەوا (علي) هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بین و بەجێی نەهێڵین، ئەگەر ئێستا پێغەمبەر(ﷺ) نەماوە خۆ فەرموودە پیرۆزەکانی ماون، ئەگەر هەموو کاتێک فەرموودەکانی بخوێنینەوە و جێبەجێیان بکەین، ئەوە وەک ئەوە وایە، هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)بین.

**پێشەوا (علي)(رضي الله عنه) لە کاتی کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (مدینة):**

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی کۆچ بکات بۆ شاری (مدینة)، هەوڵیدا پێشتر کاروبارەکانی لە (مكة)دا تەواو بکات، ئینجا بچێت بۆ شاری (مدینة)، پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەدەکرد (مكة) بەجێ بهێڵێت، بەڵام ناچاربوو، چونکە بێباوەڕەکان وازیان لێ نەدەهێنا و ئازاریان دەدان.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی لەگەڵ پێشەوا (أبوبکر الصدیق) کۆچ بکات، بەڵام هەندێک شتومەک و ئەمانەتی خەڵکی شاری (مکة)ی لەلا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیویست بیانداتەوە و دەست خاوەنەکانیان، بۆ ئەمە بڕیاریدا پێشەوا (علي بن أبو طالیب) بەجێ بهێڵێت، تا ئەمانەتەکان بگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لە پێشەوا (علي) کرد لە شوێنەکەی ئەودا بخەوێت و لەوێ بێت، تا ئەمانەتەکان تەسلیم بکاتەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێشەوا (أبوبکر) پێکەوە چوونە دەرێ، تا کۆچ بکەن بۆ شاری (مدینة).

پێشەوا (علي)ش لە شوێنەکەی پێغەمبەر (ﷺ) نووست، بێباوەڕەکانیش نەخشەیان دانابوو پێغەمبەر (ﷺ) بکوژن، کاتێک شەو چوون بۆ ئەوێ سەیر دەکەن پێشەوا (علي) لە شوێنی پێغەمبەر (ﷺ)دایە، وتیان: ئەی (علي) کوا (محمد)؟ ئەویش وتی: نازانم لە کوێیە؟ بێباوەڕەکان تەواو بێ هیوا بوون و نەیاندەزانی چی بکەن، پێشەوا (علي) خۆشەویست زۆر خۆشحاڵ بوو کە توانی بە سەرکەوتوانە کارەکانی جێبەجێ بکات و هیچ ترسی لە مردن نەبوو.

## کۆچکردنی پێشەوا (علي)(ﷺ) بۆ (مدينة):

لە دوای ئەوەی (علــــي بـــــن أبــــي طاليـــب) یەک یەک ئەمانەتەکانی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی و دڵنیـابوو هـیچ کەس نییە ئەمـانەتەکەی وەرنەگرتبێتەوە، ئینجا بڕیاریـدا کۆچ بکـات بـۆ (مدینـة) بـۆ لای پێغەمـبەر(ﷺ)، بەڵام پێشـەوا (علـي) نە وشتر و نە ئەسپی پێ نەبوو، هاوڕێشی لەگەڵ دا نەبـوو، ئەمەش کـــارێکی ســـەختە، بەڵام پێشــــەوا (علــــي) ئامـــادەبوو هەر ناڕەحەتییەک بچەژێت، تا زووتـر بە دیـداری پێغەمـبەر(ﷺ)شـاد بێتەوە. ئەو ئامـادەبوو برسـێتی و تینـوێتی و مانـدوێتی بچێژێت، بەڵام بگات بەپێغەمبەر(ﷺ).

پێشـەوا (علي) بە ڕۆژ ڕێی نەدەکرد، چونکە خۆرەتـاوێکی زۆر گەرم بوو، کاتێک شەو دەهات پێشەوا (علي) بەتەنها و بە پــێ دەڕۆشـــت بە ڕێـدا و بەوجـۆرە پێشـــەوا (علـــي) بەوپەڕی مانـدوێتی و سـەختییەوە ڕێـگەی کـۆچی بـڕی، تـا گەیشـتە خزمەتی پێغەمـبەر(ﷺ)و جارێکی تر پێی شاد بوویەوە.

**ژیانی پێشەوا (علي)(ﷺ) لە (مدينة)دا:**

کاتێک پێشەوا (علي) گەیشتە شاری (مدينة)، سەیر دەکات موسڵمانان هەموویان لەوێ کۆبوونەتەوە و خۆشی و کامەرانی دایگرتوون، موسڵمانان لە جیاتی ئەوەی ئازار بدرێن ڕێزیان لێدەگیرێت و ماڵ و سامانیان لەگەڵدا دابەش دەکرێت و بە براگیان و خوشکی بەڕێز ناوی یەکتر دەبەن، سەیر دەکات موسڵمانان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە مزگەوتەوە و سەرقاڵی ئیشکردنن، هەروەها خەڵکێکی زۆری (مدينة)ش موسڵمان بون و پێغەمبەر(ﷺ) هەموو موسڵمانێکی (مكة)ی لەگەڵ موسڵمانێکی (مدينة)دا کردووە بە برا و ماڵ وسامان و زەوی و باخیان بۆ هەردووکیان دەبوو.

بەمجۆرە چاکترین بەش و خۆشی بوو بە بەشی پێشەوا (علي).

**پەند و ئامۆژگاری:**

هەموومان دەبێت خاک و وڵاتی خۆمانمان خۆشبوێت، وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) وڵاتی خۆی خۆش ویست، بەڵام دەبێت بیرمان بێت ئایینەکەمان لە هەموو شتێک گرنگترە.

دەبێت ئێمەش هەوڵ بدەین ئەمانەتەکان بپارێزین و بیاندەینەوە دەستی خاوەنەکانیان، سەیربکەن پێشەوا (علي) چۆن

ئەمانەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی.

موسڵمان ئامادەیە لە پێناو خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەیدا هەموو ئازار و ناڕەحەتییەک کە بێتە ڕێی بیچەژێت بۆ ئەوەی ئەوان لێی ڕازی بن.

چاکترین برایەتی و خوشکایەتی برایەتی و خوشکایەتی ئیسلامە، موسڵمان دەبێت چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ برا و خوشکە موسڵمانەکەی خۆیشی پێی خۆش بێت و یارمەتی یەکتر بدەن.

**ژنهێنانی پێشەوا (علي)(ﷺ) کوڕی (أبو طاليب) :**

پێشەوا (علي بن أبي طاليب) لە (مدينة)دا بوو، بەڵام تەمەنی گەیشتبووە ئەوەی کە ئیتر بیر لە هاوسەرگیری بکاتەوە و ژن بهێنێت، بۆ ئەمەش بیری دەکردەوە کە چ ئافرەتێک بهێنێت، هەرچەندە سەیری دەکرد چاکترین ئافرەتێک کە دۆزییەوە بریتی بوو لە (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە هەم کچێکی پاک و باوەڕدار بوو، هەم باوکێکی گەورە و خۆشەویستی هەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ)بوو.

بۆ ئەمەش کەسێکی نارد، تا بچێتە داوای (فاطمة)، پێشەوا (علي) خۆی شەرمی دەکرد بچێت، چونکە ماوەیەکی زۆر لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) ژیابوو، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕازی بوو،

بەمجۆرە پێشەوا (علي) و (فاطمة) بوون بە هاوسەری یەکتر، پێشەوا (علي) کەسێکی هەژار بوو و ماڵ و سامانێکی کەمی هەبوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بیانووی پێ نەگرت، چونکە گرنگ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبوو کە کوڕەکە کەسێکی باوەڕدار و ژیر و بە ڕەوشت بێت، پێغەمبەر(ﷺ)پێشەوا (علي) و (فاطمة)ی فێری ئەوە کرد کە ڕێزی یەکتر بگرن و یەکتریان خۆش بوێت و لەسەر پارە و سامان ژیانی خۆیان تاڵ نەکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ڕازی بن بەوەی کە هەیانە.

لە ئەنجامی هاوسەرگیری (فاطمة) و پێشەوا (علي)یەوە خوای گەورە چەند منداڵێکی پێ بەخشین کە ناودارترینیان پێشەوا(حسن) و (حسین)بوون خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت.

### پێشەوا (علي)(ﷺ) لە جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا:

پێشەوا (علي) وەک زۆربەی هاوەڵانی تر لە جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا بەشداری دەکرد، بەڵام ئەو لە هاوەڵان جیاوازتر بوو، چونکە زیاتر بەشداری لە جەنگەکاندا هەبوو و ڕۆڵێکی گەورەتری هەبوو.

پێغەمبەر(ﷺ)یش لە جەنگەکاندا گرنگییەکی زیاتری بە پێشەوا (علي) دەدا.

لە جەنگی بەدردا، کە سەرەتای جەنگی موسڵمانان بوو، بێباوەڕان داوایان کرد کە هەر لایەنەو سێ کەس بهێنن تا جەنگ بکەن، بێباوەڕان سێ کەسیان هاتنە ناو مەیدانەکەوە، موسڵمانەکانیش سێ کەسیان چوونە دەرەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) گێڕاندنییەوە و سێ کەسی تری نارد، یەکێک لەوانە (حمزة بن عبد المطلب) و یەکیان (أبو عبیدة) و ئەوی تریشیان پێشەوا (علي) بوو، پێشەوا (علي) زۆر بە ئازایانە بێباوەڕەکەی بەرانبەری خۆی کوشت، (حمزة)ش بەرانبەرە بێباوەڕەکەی خۆی کوشت، ئینجا پێکەوە چوون بۆ یارمەتیدانی (أبوعبیدة) کە بریندار بووبوو، پێشەوا (علي) لە جەنگەکەدا زۆر بە دلێرییەوە جەنگی دەکرد و لە جەنگەکەدا موسڵمانان سەرکەوتن.

هەروەها پێشەوا (علي) لە جەنگەکانی تریشدا بەشداری دەکرد، ئەو ئامادەبوو گیانی خۆی لە پێناوی خوای گەورەدا بەخت بکات، چونکە دەیزانی، ئەگەر لەو جەنگەدا بکوژرێت ئەوا شەهید دەبێت و بەهەشتی بەرین دەبێتە شوێنی.

لە رێککەوتننامەی (حدیبیە)شدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بچێت بۆ سەردانی ماڵی خوا، کەچی قورەیشییەکان رێگەیان پێنەدا، لە کۆتاییدا بڕیار درا کە رێککەوتن ببەستن،

ئەو کەسەی دەقی ڕێککەوتننامەکەی دەنووسی پێشەوا (علي) بوو، بەمجۆرە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمجارەش گرنگی تایبەتی بە پێشەوا (علي بن أبو طاليب)دا.

هەروەها لە جەنگی خەیبەریشدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر جوولەکەکانی خەیبەر، موسڵمانان بۆ ئەو جەنگە کۆبوونەوە، بەڵام قەڵاکە زۆر سەخت بوو و جوولەکەکان زۆر بە سەختی بەرگرییان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێکەوە خوا و پێغەمبەری خوای زۆر خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەری خوایش ئەویان زۆر خۆش دەوێت، ئەو کەسەش پێشەوا (علي) بوو.

بەڵام پێشەوا (علي) لەو کاتەدا ئازاری چاوی هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ)یش (علي) بانگکرد و تفی دا لە چاوی بۆ ئەوەی چاوی چاک بێتەوە، یەکسەر چاوی پێشەوا (علي) چاک بوویەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکەی دایە دەست و لە کۆتاییدا موسڵمانەکان سەرکەوتن، ئەمەش ڕێزێکی تری گەورە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوا (علي) گرت.

پێشەوا (علي) یەکێکە لەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، واتە: لە ڕۆژی دواییدا یەکسەر دەچنە بەهەشت، چونکە پێشەوا (علي) کەسێکی زۆر لە خواترس و بە ئیمان و ڕێکوپێک و موجاهید بوو، هەروەها پێشەوا (علي) لە

فەتحـــی (مکـــة) و جەنگـــی حونەینـــدا بەشـــداری کـــردووە و پێغەمـــبەر(ﷺ) هەر ئەرکێکـی پـێ سـپاردبێت پێشـەوا (علـي) جێبەجێی کردووە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

موسڵمان هەوڵبدات لە هەموو کاروبارێکی ژیانیدا هاوڕێ و دۆستی ئیماندار پەیدابکات، لە قوتابخانە و خوێندنگە و دووکـان و ئیشـکردن و...هتـد. وەک چـۆن پێشـەوا (علـي) ژنێکـی ئیمانداری هێنا.

دەبێت موسڵمان ئامادە بێت ماڵ وگیانی لە پێناو ئیسلامدا بەخـت بکـات، سـەیربکەن هـاوەڵان چـۆن بە خۆشـحاڵی و شانازییەوە لە جەنگەکاندا لە پێناو سەرخستنی ئایینی ئیسلامدا بەشداریان دەکرد، چۆن لە ماڵەوە و کاتی ئاشتیشدا بانگەوازیـان بۆ ئایینی ئیسلام دەکرد.

دەبێـت منـداڵان و گەنجـان وەک پێشـەوا (علـي) لە هەوڵـی زانیاری و خوێندندا بن.

**پێشەوا (علي)(رضي الله عنه) لە کاتی مردنی پێغەمبەر دا(ﷺ):**

لە ساڵی یازدەی کۆچیدا پێغەمـبەر(ﷺ) لە دوای ئەوەی لە کۆتا حەجی ماڵی خوای گەورەدا گەڕایەوە بۆ شاری (مدینـة)،

هەستی بە نەخۆشییەکی سەخت دەکرد و ئازارەکەی هێندە زیادی کرد، تا ئەوەی لە جێگەدا کەوت، لەو ماوەیەدا پێشەوا (علي) هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و هیچ کات بە جێی نەدەهێشت.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست بچێت بۆ ماڵی یەکێک لە خێزانەکانی تری، پێشەوا (علي) یارمەتی دەدا، کاتێکیش دەیویست بچێت بۆ مزگەوت هەر پێشەوا (علي) لەگەڵیدا بوو، ئەمە وایکردبوو کۆتا ساتەکانی تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ پێشەوا (علي)دا بێت، تا ئەوەی لە کۆتاییدا گیانی پاکی گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە.

موسڵمانان دووچاری خەفەت و ناڕەحەتی بوون، پێشەوا (علي) تەواو خەفەتبار بوو، چونکە هەم پێغەمبەرەکەی و هەم ئامۆزاکەی و هەم باوکی خێزانەکەی کە محمد(ﷺ)بوو مرد، پێشەوا (علي) بە تەرمی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە سەرقاڵ بوو، دوای ئەوە قسەکرا لەسەر ئەوەی چۆن تەرمی پێغەمبەر(ﷺ) بشۆن؟ پێشەوا (علي) تەرمەکەی شۆرد و لەگەڵ کۆمەڵێک لە موسڵمانان ئەسپەردەیان کرد.

بەم جۆرە پێشەوا (علي) جارێکی تر ژیانی تووشی ناڕەحەتی بوویەوە و هێندەی تر هەستی بە تەنهایی و بێتاقەتی دەکرد،

چونکە پێغەمبەرەکەی کە هەمیشە ئاگای لێی بوو بەجێی هێشت.

### پێشەوا (علي)(رضي الله عنه) لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا:

دەتوانین بەم شێوە ژیانی پێشەوا (علي) لە سەردەمی جێنشینەکاندا باس بکەین:

### پێشەوا (علي) لە سەردەمی پێشەوا (أبوبكر)دا(رضي الله عنه):

پاش ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد، موسڵمانان هەموو بەیعەتیان دا بە پێشەوا (أبوبكر)، بەڵام لەو کاتەدا پێشەوا (علي) سەرقاڵی ئەسپەردەکردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، بۆیە بەیانی پێشەوا (علي) چوو لە مزگەوت بەیعەتی دا بە پێشەوا (أبوبكر).

لە سەردەمی دەسەڵاتی پێشەوا (أبوبكر)دا، پێشەوا (علي) گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خەلیفەی موسڵمانانی دەکرد، هەروەها موسڵمانانی فێری زانستە شەرعییەکان دەکرد، لەم سەردەمەدا پێشەوا (علي) تووشی ناخۆشییەکی زۆر سەخت بوو، ئەویش ئەوەبوو کە (فاطمة)ی خێزانی کۆچی دوایی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە، پێشەوا (أبوبكر) لەو کاتەدا چوو بۆ ماڵی

پێشەوا (علي) و سەردانی (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری(ﷺ) کرد، لەو کاتی نەخۆشی (فاطمة)دا پێشەوا (أبوبکر) (أسماء)ی ژنی خۆی نارد، تا خزمەتی (فاطمة) بکات و ئاگاداری بێت.

پێشەوا (علي) یەکێک بوو لەو کەسانەی کە پێشەوا (أبوبکر) ڕاوێژی پێکرد، تا بزانێت لە دوای خۆی کێ بکات بە جێنشینی موسڵمانان، پێشەوا (علي)ش پێی باش بوو پێشەوا (عمر بن الخطاب)ببێت بە جێنشینی موسڵمانان.

**پێشەوا (علي) لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا(رضي الله عنه):**

پێشەوا (علي) لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا بەردەوام لە ژێر فەرمانی خەلیفەدا بوو، ئەو خزمەتی موسڵمانانی دەکرد، فێری بنەماکانی ئیسلامی دەکردن، پێشەوا (عمر)یش لە کاروبارەکاندا ڕاوێژی بە پێشەوا (علي) دەکرد.

دەگێڕنەوە جارێک پێشەوا (علي) زرێیەکی لێ ون دەبێت، جوولەکەیەک دەیبات بۆ خۆی، کاتێک پێشەوا (علي) دەیبینێت پێی دەڵێت ئەوە هی منە، بەڵام جوولەکەکە پێی ناداتەوە، ناچار دەچێت بۆ لای پێشەوا (عمر)، تا دادگاییان بکات، لەوێ پێشەوا (عمر) بە پێشەوا (علي) دەڵێت: هیچ بەڵگەیەکت هەیە کە ئەوە هی تۆیە؟ ئەویش دەڵێت: نا، بە

جـووله‌که‌که‌ش ده‌ڵێـت: ئامـاده‌ی سـوێند بخۆیـت هـی تـۆیه‌؟ جووله‌که‌که‌ش سوێند ده‌خوات که‌ هی خۆیه‌تی، به‌وجۆره‌ پێشه‌وا (علي) ڕازی ده‌بێت و دادگاییه‌که‌ی قبووڵ ده‌بێت.

**پێشه‌وا (علي) له‌سه‌رده‌می پێشه‌وا (عثمان)دا(ﷺ):**

کاتێـک پێشـه‌وا (عمـر) شـه‌هیدکرا، له‌ پـێش شـه‌هیدبوونیدا کۆمه‌ڵێـک له‌ هـاوه‌ڵانی کـۆکردنه‌وه‌ که‌ شـه‌ش که‌س بـوون، تـا که‌سێک هه‌ڵبژێرن بـۆ جێنشـین، ئه‌وانـیش پێشـه‌وا (عثمـان)یـان هه‌ڵبـژارد، بـۆیه‌ موسـڵمانان هه‌موویـان به‌یعه‌تیـان دا به‌ پێشـه‌وا (عثمان) و پێشه‌وا (علي)ش به‌یعه‌تی پێدا.

له‌ سـه‌رده‌می پێشـه‌وا (عثمـان)دا پێشـه‌وا (علـي) گـوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌کانی خه‌لیفه‌ بوو، هه‌روه‌هـا خزمه‌تـی موسـڵمانانی ده‌کـرد، کاتێــک پێشــه‌وا (عثمــان) قورئانه‌کــانی کــۆکرده‌وه‌ و یه‌ک قورئـانی هێشـته‌وه‌، پێشـه‌وا (علـي) ده‌ستخۆشـی لێکـرد و به‌ کارێکی چاکی ده‌زانی.

به‌وجۆره‌ پێشه‌وا (علي) ده‌ژیا، تـا ئه‌وه‌ی سـه‌به‌ئیه‌ ناپاکه‌کـان سه‌ریان هه‌ڵدا و بڕیاریاندا پێشه‌وا (عثمان) شه‌هید بـکه‌ن، پێشـه‌وا (علـي) به‌و کـاره‌ نـاڕازی بـوو، به‌ڵام نه‌یـده‌توانی ڕێگرییـان لـێ بکات، چونکه‌ ئه‌وان زۆر بوون.

پرسیار: سه‌به‌ئیه‌کان کێن؟

وەڵام: ئەو کۆمەڵە ناپاکە خراپەکارانە بوون کە بە پێشەوا (عثمان) ڕازی نەبوون و بڕیاریاندا پێشەوا (عثمان) شەهید بکەن و ئەوەبوو دواتر شەهیدیان کرد، ناوی سەرکردەکەیان (عبدالله بن سبأ) بوو.

**پێشەوا (علي)(ﷺ) لە سەردەمی خیلافەتیدا:**

کاتێک پێشەوا (عثمان) شەهیدکرا، لە دوای ئەو موسڵمانان پێشەوا (علي)یان کرد بە جێنشینی خۆیان، بەڵام هەندێک لە موسڵمانەکان وتیان: دەبێت بزانین کێ پێشەوا (عثمان)ی کوشتووە ئێمەش ئەو بکوژینەوە، ئینجا پێشەوا (علي) ببێت بە جێنشین، چونکە موسڵمانان پێشەوا (عثمان)یان زۆر خۆشدەویست، پێشەوا (علي) کاتێک دەسەڵاتی گرتە دەست، کەوتە ڕێکخستنی کاروبارەکانی دەوڵەت، هەوڵی دەدا مافی هەموو کەسەکان بدات هەروەک چۆن جێنشینەکانی تریش وایان کرد، هەروەها پێشەوا (علي) هەوڵی دەدا دادپەروەری لە ناو وڵاتدا بڵاو بێتەوە، وتاری بە سوودی پێشکەش بە خەڵک دەکرد و لە مزگەوتدا نوێژی بۆ دەکردن، هەرچەندە پێشەوا (علي) سەرکردەی موسڵمانان بوو، کەچی وەک هەژارێک ژیانی دەبردەسەر، چونکە ئەو پێی وابوو دەبێت هەموو موسڵمانان خۆراک و نان وماڵیان هەبێت، ئینجا خۆی تێر نان بخوات،

پێشەوا (علي) لە کاروبارەکانیدا زۆر ماندوو دەبوو.

چونکە کۆمەڵێک خەڵکی لاسار و ئاژاوەچی هاتبوونە ناو خاک و دەسەڵاتەکەیەوە، ئەویش دەیویست بە لەسەرخۆیی لایان ببات، یەکێک لەو ناخۆشیانەی لە سەردەمی دەسەڵاتی پێشەوا (علي)دا ڕویدا بریتی بوو لە جەنگی نێوان موسڵمانان.

پرسار: بۆچی موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا جەنگیان دەکرد؟

وەڵام: چونکە هەندێک لە موسڵمانەکان پێیان وابوو دەبێت یەکسەر ئەو کەسانە بکوژرێن کەپێشەوا (عثمان)یان شەهید کردووە، بەڵام هەندێکی تریان پێیان وابوو، دەبێت کەمێک خۆڕابگرن، ئینجا بیانکوژن، بۆ ئەوەی زاڵ ببن بەسەریاندا، لەو جەنگەدا موسڵمانان تووشی ئازار و ناڕەحەتییەکی زۆربوون و خەفەت و پەژارە دایگرتن.

چونکە سەیریان دەکرد هەموویان موسڵمانن، کەچی یەکتر دەکوژن، پێشەوا (علي)ش زۆر بێزار و خەفەت بار بوو و نەیدەزانی چی بکات، تا ئەوەی جەنگەکە کۆتایی پێهات، پێشەوا (علي) هێندە بێزاربوو، چەندین جار داوای لە خوای گەورە دەکرد بیباتەوە بۆ لای خۆی، لە ڕاستیدا ئەوە وانەیەکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان، هەتا ڕۆژی دوایی کە جارێکی تر لە ناوخۆیاندا جەنگ نەکەن و وریابن دووڕووەکان و دوژمنەکانیان

تووشی جەنگیان نەکەن، بەڵکو دەبێت یارمەتی یەکتر بدەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت موسڵمان ملکەچی سەرکردەی موسڵمانان بێت و لە فەرمانی دەرنەچێت، سەیرکەن پێشەوا (علي) چۆن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێشەوا (أبوبكر) و (عمر) و (عثمان) بوو، بەڵام نابێت لە کاری خراپ بەگوێیان بکەین، بەڵکو دەبێت هەرکارێکی چاکیان وت جێبەجێی بکەین.

٢- موسڵمان، دەبێت لەبەردەم سەختی و ناڕەحەتییەکانی ژیانیدا خۆڕاگر بێت و خۆی تووشی تاوان و گوناه نەکات، ئەوەتا پێشەوا (علي) لە کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) و (فاطمة)ی خێزانیدا خۆڕاگر و لەسەرخۆ بوو.

٣- دەبێت ئاگاداربین کەسانی ناپاک وەک سەبەئییەکان نەبنە هۆی ئاژاوەی ناو موسڵمانان.

٤- نابێت موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا جەنگ بکەن و خوێنی یەکتر بڕێژن، چونکە موسڵمانان هەموویان برای یەکترن و هەموویان شوێنکەوتەی ئایینی ئیسلامن، ئەگەریش شەڕیانکرد، دەبێت زوو بە زوو ئاشتیان بکەینەوە.

**شەهیدبوونی پێشەوا (علي)(رضي الله عنه):**

پێشەوا (علي) زۆر لەو بارودۆخە ناخۆشەی کەتێیدا بوو بێزاربوو، چونکە سەیری دەکرد موسڵمانان خوێنی یەکتر دەرێژن و هەموان دژبەیەکن.

بۆیە داوی لەخوای گەورەکرد، تا بیباتەوە بۆلای خۆی، پێشەوا (علي) زۆر حەزی لە شەهیدی دەکرد و لە نزاکانیدا هیوای شەهیدی دەخواست.

لە شاری (مدينة) لەوکاتەدا کەسێک بەناوی (عبدالرحمن بن ملجم) هەبوو، ئەو ئامادە نەبوو بەیعەت بدات بە پێشەوا (علي).

بەڵکو زۆر ڕقیشی لە پێشەوا (علي) بوو، لەگەڵ دوو کەسی تردا ڕێککەوت کە لە کاتی دیاری کراو و لە نوێژی بەیانیدا هەریەکەیان یەکێک لە سەرکردەکانی موسڵمانان بکوژن کە بریتی بوون لە: ((علي بن أبي طاليب)، (معاوية بن أبو سفيان) و (عمرو بن عاص).

کاتێک هەریەکە لەوانە چوون بۆ کوشتنی کەسی خۆیان، پێشەوا (معاوية) و (عمرو) ڕزگاریان بوو، بەڵام (عبدالرحمن بن ملجم) بە خەنجەر دای بەسەر پێشەوا (علي)دا و شەهیدی کرد.

## پرسیارەکان

١- پێشەوا (علي) کوڕی کێ بوو؟ چی پەیوەندییەکی هەبوو بە پێغەمبەری خواوە؟

٢- دەکرێت باسی ژیانی پێشەوا (علي) لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ)دا بکەیت؟

٣- چۆن پێشەوا (علي) موسڵمان بوو؟

٤- ئەو کەسەی لە شوێنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) خەوت کێ بوو؟

ا: (عمر) . ب: (زيد). ج: (عثمان). د: (علي).

٥- باس لە کۆچ کردنی (علي) بکە بۆ شاری (مدينة).

٦- ناوی منداڵەکانی پێشەوا (علي) چی بوون؟

٧- خێزانەکەی پێشەوا (علي) ناوی چی بوو؟

ا: (خنساء) . ب: (فاطمة). ج: سازگار. د: (سمية).

٨- پێشەوا (علي) لە جەنگی بەدردا چی کرد؟

٩- گرنگترین کارەکانی پێشەوا (علي) لە سەردەمی خیلافەتیدا چی بوون؟

١٠- باس لە دادگایی کردنەکەی پێشەوا (علي) لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا بکە.

١١- کێ پێشەوا (علي) شەهید کرد؟...

١٢- ئایا تۆ پێت ناخۆش بوو کە پێشەوا (علي) شەهید بوو؟

## ٥- (حسن بن علي)(رضي الله عنه)

**ناوی:**

(حسن بن علي بن أبي طاليب)ە، ناوی باوکی (علي)یە، ناوی دایکی (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، برایەکی زۆر خۆشەویستی هەبوو ناوی (حسین)بوو، چەند خوشک و برایەکی تری هەبوو.

**لە دایکبوونی پێشەوا (حسن)(رضي الله عنه):**

موسڵمانان کۆچیان کردبوو بۆ شاری (مدینة)، پێغەمبەری ئازیزیش دواتر کۆچی کرد بۆ (مدینة)، (علي بن أبي طاليب)ی لە شوێنی خۆی دانا، دوایی پێشەوا (علي بن أبي طاليب)یش کۆچی کرد بۆ (مدینة) و چووە لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێشەوا (علي) داوای (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕازی بوو، بەو جۆرە

پێشەوا (علي) و (فاطمة) بەیەکەوە خێزانێکیان دروستکرد و لە شاری (مدینـــة) و لەگەڵ پێغەمـــبەری ئـــازیزدا بە ئیمـــان و خواپەرستییەوە ژیانیان دەبردە سەر.

ڕۆژێکیـــان لە مـــانگی ڕەمەزانـــدا، پێغەمـــبەر(ﷺ) کە بە ڕۆژوو بوو ویستی سەردانی ماڵی (فاطمة)ی کچی بکات، ئەو دەیزانــی (فاطمــة) نــزیکە منــداڵی ببێــت، ئەوە بــوو (فاطمــة) منــداڵی بــوو، بــۆیە پێغەمــبەر(ﷺ) ویســتی بچێــت بــۆ لایــان و پیرۆزباییان لێ بکات و منداڵەکەش ناوبنێن. پێغەمبەری ئازیز بەو تەمەنە گەورەیەی خۆیەوە چوو بۆ ماڵی پێشەوا (علي) و (فاطمة) و لەوێ دانیشت، پاش کەمێک فەرمووی: (اروني ابني ما سميتموه) ئادەی کوڕە شرینەکەمم نیشان بدەن، تا بزانم نـــاوی چـــی لێـــدەنێن، پێشـــەوا (علـــي) وتـــی: دەمەوێـــت ناوی(حرب)بێـــت، واتە جەنـــگ، بەڵام پێغەمـــبەر(ﷺ) حەزی نەکرد و فەرمووی (بل هو حسن)، نا دەبێت ناوی (حسن) بێت و بەو جۆرە منداڵەکەیان ناو نا (حسن)، ئینجا پێغەمبەری ئازیز پێشـەوا (حسـن)ی گـرتە بـاوەش و بانگیـدا بە گوێیـدا و دواتـر پێغەمـبەر(ﷺ) مەڕێکـی چـاکی بـۆ پێشـەوا (حسـن) سـەربڕی وکردی بەخێر لە ڕێگەی خوادا، نزای خێری بۆ پێشەوا (حسـن) کرد، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەو کاتەوە پێشەوا (حسن)ی

زۆر خۆش دەویست و هیوای وابوو کەسێکی چاک و موسڵمان و بەڕێزی لێ دەرچێت.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ)ناوی منداڵەکەی گۆڕی بۆ (حسن)؟

وەڵام: چونکە دەبێت ناوی جوان و باش لە منداڵ بنرێت، ئەوان ناویان نابوو جەنگ، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا (حسن)، واتە: کەسی چاک و ڕێکوپێک.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بانگی دا بە گوێی (حسن)دا؟

وەڵام: چونکە منداڵ کاتێک لە دایک دەبێت، شەیتان دەیەوێت ئازاری بدات، بەڵام کاتێک بانگ درا بە گوێی منداڵدا شەیتان دوور دەکەوێتەوە، چونکە شەیتان زۆر ڕقی لە بانگە و لە بانگدان دەترسێت.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت سەردانی خزمەکانمان بکەین، هەروەک پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی پێشەوا (علي) و (فاطمة)ی کرد.

٢- دەبێت هەمیشە ناوی جوان لە منداڵ بنێین و یەکتری بە ناوی جوانەوە بانگ بکەین.

-٣ ئەگەر ئێمە ڕۆژانە گوێ لە بانگ بگرین، ئیتر شەیتان لێمان ڕادەکات و نزیک نابێتەوە، چونکە شەیتان ڕقی لە بانگە.

-٤ فێری ئەوە دەبین، ئەگەر پارە و سامانمان هەبوو، دەبێت لەکاتی منداڵ بووندا مەڕوماڵات سەربڕین و خێر بکەین بۆ ئەو منداڵە، هەروەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) مەڕێکی بۆ (حسن)ی کچەزای خۆشەویستی سەربڕی، هەروەها نزای خێری بۆ بکەین و پێ خۆشحاڵ بین کە لە دایکبووە.

**ژیانی منداڵی پێشەوا (حسن)(رضي الله عنه):**

پێشەوا (حسن) هەر لە منداڵیەوە ژیانی لەگەڵ قورئان و نوێژ و کاری چاک و جوان و ڕەوشتی جواندا دەبردە سەر، چونکە دایک و باوکی و باپیری کە پێغەمبەر(ﷺ)بوو هەمیشە سەرقاڵی نوێژ و قورئان و کارکردنی چاک و ڕەوشتی جوان بوون، پێشەوا (حسن)یش لەوانەوە فێری ئەو شتە جوانانە بوو، چونکە ئەوان پێشەوا (حسن)یان فێر دەکرد.

دایک و باوکی پێشەوا (حسن) هەژار بوون و پارەی زۆریان نەبوو، بەڵام پێشەوا (حسن)یش ژیر بوو و بیانووی پێ نەدەگرتن، هەرچییان هەبوایە، پێی ڕازی بوو و سوپاسی خوای لەسەر

دەکرد، چونکە پێشەوا (حسن) دەیزانی ئیمان لە هەموو شتێک گرنگترە، ئەگەر ڕۆژێک نانی کەم بخوات، ئەوا دەتوانێت خۆڕاگر بێت و خوای گەورە پاداشتی چاکەی بۆ بنووسێت، بەڵام، ئەگەر ڕۆژێک ئیمانی نەبێت، ئەوا خوای گەورەی لێی دەڕەنجێت و تووشی تاوان دەبێت، بۆیە پێشەوا (حسن) هەر لە منداڵیەوە ژیر و تێگەیشتوو بوو.

پێغەمبەری ئازیز پێشەوا (حسن)ی زۆر خۆش دەویست و هەموو جار لە باوەشی دەگرت و قسەی بۆ دەکرد و لەگەڵیدا یاری دەکرد و دەیبرد بۆ مزگەوت و لەلای خۆی دایدەنیشاند و حەزی دەکرد هەمیشە لەلای بێت، پێغەمبەر(ﷺ) هێندە پێشەوا (حسن)ی خۆشدەویست، دەیفەرموو(اللهم إني أحبه فأحبه وأحب من يحبه).

واتە: (خوایە، من (حسن)م خۆش دەوێت، دەی خوایە، تۆش خۆشت بوێت و ئەو کەسەشت خۆش بوێت کە(حسن)ی خۆش دەوێت).

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ)پێشەوا (حسن)ی لەگەڵ (حسین)ی برایدا برد بۆ مزگەوت، لەوێ ئەوان بۆ خۆیان یارییان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ)یش نوێژی دەکرد، (حسن) و (حسین)چوونە سەر کۆڵی پێغەمبەر(ﷺ) و یارییان دەکرد، پێغەمبەری ئازیز حەزی

نەدەکرد یارییەکەیان لێ تێک بدات و وەستا، تا خۆیان لاچوون، دوایی هاوەڵان گلەییان کرد کە بۆچی وا دەکەن و دەیانویست لە نـــوێژەکەی پێغەمـــبەر(ﷺ)دووریـــان بـــخەنەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دعهما بابي هما وامي، من احبني فليحب هذين)، (وازیان لێ بێنن، بە دایک و باوکمەوە بە قوربانیانبم. هەرکەسێک منی خۆش بوێت دەبێت ئەم دوو منداڵەیشی خۆش بوێت، واتە پێشەوا (حسن) و (حسين).

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ)پێشەوا (حسن)ی دەبرد بۆ مزگەوت؟

وەڵام: بۆ ئەوەی پێشەوا (حسن) فێری مزگەوت بێت و بزانێت مزگەوت چەندە خۆشە و لەوێ تێکەڵی موسڵمانان بێت وفێری ئاکار و وتەی جوان بێت، پێغەمبەری ئازیز (حسن)ی دەخستە قەڵا دۆشکان(سەر شانی)خۆی و دەیفەرموو خوایە، من (حسن)م خۆش دەوێت دەی تۆش خۆشت بوێت، بەوجۆرە پێشەوا (حسن) زۆر جار لەگەڵ پێغەمبەری باپیریدا دەگەڕا و فێری ئاکاری جوان دەبوو.

پێشەوا (حسن) ڕێزی دایک و باوکی خۆی دەگرت و خۆشی دەویستن، ئەوانیش (حسن)یان خۆش دەویست، بەو جۆرە پێشەوا (حسن) هەر لە منداڵییەوە ژیانێکی پڕ لە ئیمانی بەسەر

دەبرد، ئەو لەگەڵ (حسین)ی برایدا دەگەڕا و یاری لەگەڵدا دەکرد، پێشەوا (حسین)لە (حسن) بچوکتر بوو و ڕێزی پێشەوا (حسن)ی دەگرت، ئەویش ڕێزی دەگرت، ئەو دوو برایە زۆر یەکتریان خۆشدەویست، بەیەکەوە دەستی یەکتریان دەگرت و دەچوون بۆ مزگەوت، لەوێ هەم یارییان دەکرد و هەم خزمەتی مزگەوتیان دەکرد، هەم لەگەڵ موسڵماناندا تێکەڵ دەبوون و گوێیان لە قسە و وتار دەگرت و هیچ کات کەسیشیان بێزار نەدەکرد.

ئەوان زۆر بە ڕێزەوە لەگەڵ خەڵکدا دەجووڵانەوە و هەرچییان بزانیایە، حەزیان دەکرد فێری کەسانی تری بکەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- پێویستە منداڵان ڕێزی دایک و باوکیان بگرن و لەگەڵیاندا بە جوانی هەڵسوکەوت بکەن، هەروەها لەوانەوە فێری کردەوەی جوان ببن و هەوڵ بدەن بیانوویان پێ نەگرن، چونکە دایک و باوک منداڵی خۆیان خۆش دەوێت، ئەگەر توانایان هەبێت هەموو شتێکیان بۆ دەکەن، دەبێت ئێمەی منداڵیش بیانوویان پێ نەگرین.

٢- هەروەها دەبێت دایک و باوکیش ڕەفتاریان لەگەڵ منداڵەکانیاندا باش بێت، فێری ئاکاری جوانیان بکەن و یارییان

لەگەڵ دا بکەن و فێری نوێژ و قورئان خوێندن و ڕەوشتی جوان و زانست و زانیارییان بکەن.

٣- منداڵی موسڵمان دەبێت پێشەوا (حسن) و (حسین)یان خۆش بوێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) خۆشی ویستوون، دەبێت لە پێشەوا (حسن) و (حسین)ەوە فێری وانەی بەسوود و جوان بین، نەوەک تەمبەڵ و لاسار و خراپ بین.

٤- دەبێت منداڵی ئازیز هەمیشە وەک پێشەوا (حسن) و (حسین)وەک برا بەیەکەوە چاک بن، دەستی یەکتر بگرن و بچن بۆ مزگەوت و قوتابخانە و لەوانەو ئیش و کارەکانیاندا یارمەتی یەکتر بدەن، ئەو کاتە خوای گەورە خۆشی دەوێن.

**پێشەوا (حسن)(رضي الله عنه) لە کاتی مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دا:**

(حسن)ی جوانکیلە و منداڵ کە تەمەنی حەوت ساڵ بوو، زۆرجار سەردانی ماڵی باپیری خۆی دەکرد، بەڵام ماوەیەک باپیری نەخۆش کەوت، بۆیە پێشەوا (حسن) لەو ماوەیەدا زیاتر سەردانی دەکرد و دەچوو، تا هەواڵی بزانێت.

پرسیار: باپیری پێشەوا (حسن) ناوی چی بوو؟

وەڵام: باپیری پێشەوا (حسن) ناوی محمد بوو کە پێغەمبەری خوا بوو.

پێغەمبەری ئازیز لە ساڵی ١١ی کۆچیدا نەخۆش کەوت و لە جێگەدا و لە ماڵی (عائشة)ی دایکماندا کەوت، ئەو نەخۆشییە وەک نەخۆشییەکانی جاران نەبوو، بەڵکو ئەمجارەیان کۆتایی ژیانی پڕ لە خێری ئازیزمان بوو.

پرسیار: بۆچی دەڵێین (عائشة)ی دایکمان؟

وەڵام: چونکە هەموو ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دایکی هەموو موسڵمانانن، ئێمەش دەبێت بە دایک ناویان بەرین، (عائشة)یش(ڕەزای خوای لێ بێت) ژنی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، بۆیە بە دایک ناوی دەبەین.

پێغەمبەری ئازیز لە نەخۆشیەکەیدا تەواو ئازاری دەچەشت، هەموو موسڵمانانیش دڵتەنگ و خەفەت بار بوون و هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەپرسی، پێغەمبەر(ﷺ)یش هێندە نەخۆش بوو کە نەیدەتوانی بێت بۆ مزگەوت و نوێژ بۆ موسڵمانان بکات، هەروەها نەیدەتوانی بچێت بۆ ماڵی (فاطمة)ی کچی و سەردانی پێشەوا (حسن) و (حسین) بکات، بەڵام (حسن) و (حسین) دەچوون بۆ لای و هەواڵیان دەپرسی.

بەڵام خوای گەورە بڕیاری دابوو پێغەمبەر(ﷺ) بباتەوە بۆ لای خۆی، ئەوەبوو پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)کۆچی دوایی کرد، موسڵمانان هەموو بە پەژارە و گریانەوە غەمباری دایگرتبوون و

نەیاندەزانی چی بکەن، (حسن) و (حسین)ی ئازیز و منداڵیش غەمبار و بێتاقەت بوون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)یان لە دەست دابوو و ئیتر باپیریان نەدەهات بۆ ماڵیان و یاری بۆ نەدەکردن، بەڵام ئەوان کاری لاساریيان نەدەنواند و بڕیاریان دابوو ئامۆژگارییەکانی باپیریان جێبەجێ بکەن.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- هەمو مرۆڤەکان دەبێت بمرن، تەنانەت پێغەمبەرەکانیش مردن، بۆیە، ئەگەر کەسێکمان مرد با خۆڕاگر بین و ڕەوشتی ناشرین ئەنجام نەدەین، چونکە ئەوە کاری خوای گەورەیە و ئێمەیش هەموومان دەمرین.

٢- دەبێت هیچ کات مردنی پێغەمبەری ئازیزمان لە بیر نەچێت، چونکە مایەی خەفەت و دڵتەنگییە بۆ ئێمەی موسڵمان.

**پێشەوا (حسن) لە سەردەمی جێنشینەکاندا:**

**پێشەوا (أبوبکر) و (عمر) و (عثمان) و (علي)(ﷺ):**

پێشەوا (حسن) لە سەردەمی جێنشینەکاندا ژیانی بەسەر بردووە.

دەتوانین بەمجۆرە باسی ژیانی لەو ماوەیەدا بکەین:

## پێشەوا (حسن) لە سەردەمی پێشەوا (أبوبکر)دا(ﷺ):

لە سـەردەمی پێشـەوا (أبـوبکر)دا پێشـەوا (حســن) لەگەڵ باوکیدا بوو، دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژەکانی دەکرد و لەگەڵ منداڵاندا دەهات و دەچوو، ڕەفتاری جوانی ئەنجامدەدا، بەڵام ناخۆشییەکی سەختی تووشبوو، ئەویش ئەوەبوو دایکی کۆچی دوایی کرد.

(فاطمـة) کە دایکـی (حسـن) و (حسـین)بوو، لە جێگەدا کەوت و مردنـی نزیکبـوویەوە، پێشـەوا (حسـن) و (حسـین)زۆر خەفەتیان بەوە دەخوارد، بەڵام باوکیان مابوو کە پێشەوا (علي) بوو.

خوای گەورە هەموو خوشک و دایکێک بە ئیمانەوە بباتەوە بۆلای خۆی.

## پێشەوا (حسن) لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا(ﷺ):

پێشەوا (حسن) لە سەردەمی پێشەوا (عمر)دا بە هەمان شێوە کەسێکی ژیر و ڕەوشتبەرز بوو، ئەو بەوردی سەیری ڕەفتار و کارەکانی پێشەوا (عمر)ی دەکرد و سوودی لێوەردەگردتن، پێشەوا (عمر)یش پێشەوا (حسن)ی زۆر خۆشدەویست، بەڵکو لە (عبدالله)ی کوڕی خۆی زیاتر ڕێزی دەگرت، چونکە پێشەوا (عمر) دەیزانی کە پێغەمبەر(ﷺ)پێشەوا (حسن)ی زۆر

خۆشویستووە، بۆیە ئەویش خۆشیدەویست و کاتێک دەسکەوت و خێر و سامان بەسەر موسڵماناندا دابەشبکرایە، پێشەوا (عمر) پێشەوا (علي) و (حسن) و (حسین)ی پێشدەخست و زیاتر ڕێزی دەگرتن.

لە کاتی شەهید بوونی پێشەوا (عمر)دا، پێشەوا (حسن) و (حسین)و هەموو موسڵمانان غەمباربوون و گریان شاری (مدینة)ی گرتەوە.

**پێشەوا (حسن) لە سەردەمی پێشەوا (عثمان)دا(ﷺ):**

دوای شەهیدبوونی پێشەوا (عمر)، پێشەوا (عثمان) بوو بە سەرکردەی موسڵمانان و خەڵکی هەموو بەیعەتیان پێدا.

پێشەوا (علي) و (حسن) و (حسین)یش بەیعەتیان پێدا.

لە سەردەمی ئەویشدا بەهەمان شێوەی پێشوو ژیانی دەبردە سەر، پێشەوا (حسن) لە جەنگەکانی دژ بە بێباوەڕەکان بەشداری دەکرد و چەندین جار چوو بۆ جیهادکردن لەڕێی خوادا.

پەیوەندی نێوان پێشەوا (عثمان) و پێشەوا (حسن) زۆر خۆشبوو، کاتێک ئاژاوە کەوتە ناو شاری (مدینة) و سەبەئیە خراپەکارەکان ویستیان پێشەوا (عثمان) شەهید بکەن، پێشەوا (حسن) لەبەردەمماڵی پێشەوا (عثمان)دا بەرگری دەکرد و نەیدەهێشت پێشەوا (عثمان) شەهید بکەن.

بەڵام سەبەئیەکان زۆربوون و لەکۆتاییدا شەهیدیان کرد.

پرسیار: سەبەئیەکان کێن؟

وەڵام: ئەو دەستە خراپەکارانەبوون کە بەسەردکردایەتی (عبدالله بن سبأ) پێشەوا (عثمان)یان شەهیدکرد.

**پێشەوا (حسن) لە سەردەمی پێشەوا (علي) باوکیدا(ﷺ):**

کاتێک پێشەوا (علي) بوو بە سەرکردەی موسڵمانان، پێشەوا (حسن) و (حسین)هەمیشە لەگەڵ باوکیاندا بوون و بۆ هەرشوێنێ بچوایە، بەجێیان نەدەهێشت و ئەوانیش دەچوون لەگەڵیدا و لەخزمەتکردنی باوکیاندابوون.

هەروەها بەردەوام نوێژ و ڕۆژووەکانیان لەبیر نەدەچوو، قورئانیان دەخوێند و هەوڵیاندەدا فێری زۆرشت ببن، بەڵام ئەوەی جێگەی خەفەتبوو بەیانییەکیان کە پێشەوا (علي) چوو، تا نوێژ بۆ موسڵمانان بکات، کەسێکی ناموسڵمانی خراپەکار بەخەنجەرێک هێرشی بردە سەر پێشەوا (علي) و شەهیدی کرد.

بەم جۆرە پێشەوا (حسن) و (حسین)باوکیشیان لە دەستدا و دووبارە تووشی خەفەت و گریان بوون، خوای گەورە دۆزەخ بکاتە بەشی بکوژەکەی پێشەوا (علي).

پرسیار: پێشەوا (حسن) کام لە جێنشینەکانی زیاتر خۆشدەویست؟

وەڵام: پێشەوا (حسن) هەموو هاوەڵانی خۆشدەویست، چونکە هەموویان هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ)بوون.

پرسیار: ئایا پێشەوا (حسن) لە دوای شەهیدبوونی باوکی داوای دەسەڵاتیکرد؟

وەڵام: نەخێر، داوای دەسەڵاتی نەکرد، بەڵکو موسڵمانان خۆیان کردیان بەجێنشین.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- ئەبێ ئێمەی موسڵمان چاوەڕێی هەر نارەحەتییەک بکەین، سەیر بکەن پێشەوا (حسن) چۆن هێشتا منداڵە، کەچی دایکی کۆچی دوایی دەکات، بەڵام پێشەوا (حسن) و (حسین) خۆڕاگربوون، لەسەر ئیمانداری خۆیان بەردەوامبوون بۆ ئەوەی لە بەهەشتدا دایکی خۆیان ببیننەوە.

٢- دەبێت ئێمەیش وەک پێشەوا (حسن) پشتگیری لە سەرکردەی موسڵمانان بکەین، یان بەدەست، یان بەدەم، یان، دەبێت لە دڵەوە حەزنەکەین تووشی ناخۆشی ببێت.

٣- دەبێت لە کاتی ناخۆشی و سەختیدا بە ژیرانە و خۆڕاگرییەوە ڕەفتاربکەین، وەک چۆن پێشەوا (حسن) لە کاتی شەهیدبوونی باوکیدا بە ژیرانە هەڵسوکەوتی کرد، تا ئەوەی لە کۆتاییدا توانی کێشەی نێوان موسڵمانان نەهێڵێت.

**پێشەوا (حسن)(ﷺ) لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا:**

پێشەوا (حسن بن علي) لە دوای شەهیدبوونی باوکی، بوو بە جێنشین و موسڵمانان هەموو بەیعەتیان پێدا.

بەڵام ماوەی جێنشینییەکەی زۆری نەخایاند و تەنها شەش مانگبوو.

ئیتر دوایی وازیهێنا بۆ پێشەوا (معاوية بن أبو سفيان) کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ).

پێشەوا (حسن) لە ماوەی دەسەڵاتیدا زۆر کەسێکی نەرمونیان و بەرێز و چاکەکاربوو، ئەو رێزی هەژارانی دەگرت و لەگەڵ موسڵماناندا تێکەڵ دەبوو و نوێژی بۆ دەکردن و وتاری بۆ دەخوێندنەوە.

هەروەها کۆمەڵێک فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ موسڵمانان گێڕاوەتەوە، خەڵکی موسڵمانیش پێشەوا (حسن) و (حسین)یان زۆر خۆشدەویستن و حەزیاندەکرد هەمیشە لەگەڵیاندا بن.

هەرکاتێک دەچوون بۆ مزگەوت، خەڵکی هێندە لە دەوریاندا کۆدەبوونەوە کە نەیاندەتوانی بچن بە رێگەدا.

پێشەوا (حسن) لە سەردەمی دەسەڵاتیدا چەند کارێکی

گرنگــی ئەنجامــدا، کە تــا ئەمــڕۆیش موســڵمانان شــانازی پێوەدەکەن:

١- چاککردنەوەی پەیوەندی نێوان موسڵمانان: وەک پیشتر وتمان لە سەردەمی پێشەوا (علي)دا موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا تووشی هەڵە و جەنگ بوون، تا لە کۆتاییدا پێشەوا (علي) شەهیدکرا، بەڵام پێشەوا (حسن) زۆر بەژیرانە و خۆڕاگری لەسەردەمی خۆیدا بڕیاریدا ئەو ناکۆکییەی نێوان موسڵمانان نەهێڵێت و ڕێگە نەدات ئیتر موسڵمانان خوێنی یەکتر بڕێژن، بۆیە ئامادەیی دەربڕی، تا واز لەدەسەڵات بهێنێت بۆ پێشەوا (معاوية بن أبو سفيان)، بەو جۆرە نێوانی موسڵمانانی چاککرد و موسڵمانان لە جەنگ و کوشتنی یەکتر ڕزگاریانبوو.

٢- ئاکار و ڕەوشتی جوان: پێشەوا (حسن) هێندە ئاکار و ڕەوشتی جوانبوو کە سەرنجی هەموو کەسێکی ڕاکێشابوو، ئەو تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسانەدا باشبوو کە ڕقیان لێیبوو، دەگێڕنەوە جارێکیان پیاوێک کە هەمووجار قسەی ناشرینی بە پێشەوا (علي) و (حسن) وتووە، دێت بۆ شاری (مدينة) و پێویستی بە نان و خۆراک و پارەیە، کاتێک داوا لەخەڵک دەکات هەموویان دەڵێن: بڕۆ بۆلای پێشەوا (حسن)، ئەویش دەچێت بۆلای و داوی لێدەکات، پێشەوا (حسن)یش ڕق و کینەی نابێت و چی دەوێت پێی دەدات.

**پەند و ئامۆژگاری:**

١- دەبێت هەمیشە موسڵمان هەوڵبدات لێبوردەبێت و نێوانی موسڵمانان چاکبکات، سەیرکەن چۆن پێشەوا (حسن) لێبوردەیی بۆ پێشەوا (معاوية) هەبوو، تا نێوانی موسڵمانانی چاککرد.

٢- موسڵمان دەبێت لەبەر خاتری خوای گەورە واز لە ڕق و کینە بهێنێت، تا دەتوانێت یارمەتی هەموو کەس بدات، سەیرکەن پێشەوا (حسن)ی چۆن یارمەتی ئەو کەسەی دا کە ڕقی لە پێشەوا (علي) و (حسن) بوو، چونکە پێشەوا (حسن) لەبەر خاتری خوای گەورە یارمەتیدا.

**مردنی پێشەوا (حسن بن علي)(ﷺ):**

وەکوو هەموو جارێک دەیڵێین، هەمووکەسێک دەبێت بمرێت، ئیتر زوو بێت، یان درەنگ، بەڵام کەسی ژیر ئەو کەسەیە پێش ئەوەی بمرێت، ئیش و کرداری چاک بۆ ڕۆژی دوایی ئەنجامبدات.

پێشەوا (حسن)یش دوای ئەوەی کۆمەڵێک کاری جوان و ڕێکوپێکی ئەنجامدا، ئیتر کاتی مردنی هات و دەبێت بمرێت.

بەڵام ئەوەی مایەی دڵتەنگییە ئەوەیە کە پێشەوا (حسن) ژەهرخوارد کرا.

لە سەرەمەرگدا بوو کە پێشەوا (حسین)ی برای هاتە لای و پێی وت: براگیان کێ ژەهری پێداویت، با بیکوژم، بەڵام پێشەوا

(حسن) ڕازی نەبوو، ئینجا وەسییەتی کرد بۆ (حسین)ی برای، کە با خۆڕاگر بێت و خۆی بپارێزێت، پاشان کەوتە نزا و پاڕانەوە لە خوای گەورە و لە کۆتاییدا گیانی پڕ باوەڕی خۆی سپارد و گەڕایەوە بـــۆ لای خـــوای گەورە و بە یەکجـــارەکی چـــوو بـــۆ بەهەشـــتی پـــان وبەرینـــی خـــوای گەورە، خـــوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا بە دیداری پێشەوا (حسن) و باوکی و باپیری و براکەی و هەموو هاوەڵانی تر لە بەهەشتی پان و بەریندا شادمان بکات.

## پرسیارەکان

١- پێشەوا (حسن) کوڕی کێ بوو؟ ئەی پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا چۆن بوو؟

٢- کاتێک پێشەوا (حسن) لەدایک بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟

٣- ئایا تۆ پێشەوا (حسن بن علي)ت خۆشدەوێت؟ بۆچی؟

٤- پێشەوا (حسن) برایەکی هەبوو، ناوی چی بوو؟

أ- (محمد). ب- (سالم). ج-(زید). د- (حسین).

٥- پێشەوا (حسن بن علي) لە شێوەدا زیاتر لە کێ دەچوو؟

ا- باوکی. ب- براکەی. ج- پێغەمبەر(ﷺ). د- دایکی.

٦- چی پەند و ئامۆژگارییەک لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)وەردەگریت؟

٧- دەتوانیت باسی کۆچی دوایی پێشەوا (حسن بن علي) بکەیت؟

٨- بۆچی، کاتێک پێشەوا (حسن) لە دایکبوو، پێغەمبەر(ﷺ)بانگیدا بەگوێیدا؟

٩- لە ئاکار و ڕەوشتی پێشەوا (حسن بن علي)یەوە فێری چی دەبیت؟

١٠- لە کاتی شەهید بوونی پێشەوا (عثمان)دا، پێشەوا (حسن بن علي) چی دەکرد؟

١١- گرنگترین کارەکانی پێشەوا (حسن) لە سەردەمی خیلافەتیدا چی بوون؟

## ٦- (أسامة بن زيد)(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە یەکێکە لە هاوەڵە گەنج و زۆر خۆشەویستەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، هەر لە منداڵییەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، هەم خۆی و هەم باوکیشی لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویست بوون، بۆیە بە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) ناسراوە.

ناوی (أسامة بن زيد)ە، کوڕێکی ڕەنگ ڕەش بوو و لووتی پان بوو، (زيد)ی باوکی لە جەنگی موئتەدا شەهید بوو، دایکی ناوی (أيمن) بوو کە شیردەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

(أسامة) دوو کوڕی هەبوو بە ناوەکانی (محمد) و (حسن) کەفەرموودەیان لە باوکیانەوە دەبیست و دواتر دەیانگێڕایەوە بۆ موسڵمانان.

(أسامة) لە سەردەمی ئیسلامدا لە دایکبوو، لە ساڵی سێی، یان چوار، یان پێنجی پێغەمبەرایەتی لە دایکبوو.

دایکی باوەڕداران (عائشة) دەفەرموێت گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو، فەرمووی: (هەرکەس خوا و پێغەمبەری

خوای خۆشدەوێت، دەبێت (أسامة بن زید)ی خۆش بوێت). هەروەها دەیفەرموو: (کێ منی خۆشدەوێت، دەبێت (أسامة)شی خۆش بوێت).

جاری وا هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) (أسامة) و (حسن)ی کچەزای خۆی دەگرتە کۆش و یەکێکیانی لەسەر ڕانێکی و ئەوی تری لەسەر ڕانەکەی تری دادەنا، دەیفەرموو: (خوایە، من ئەم دوانەم خۆش ئەوێن، دەی تۆیش خۆشت بوێن)، یان دەیفەرموو: (خوایە، ڕەحمیان پێ بکە، چونکە من ڕەحمم هەیە بۆیان).

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر نازی (أسامة)ی ڕادەگرت و گرنگی پێدەدا، دایکی باوەڕداران (عائشة) دەڵێت جارێکیان (أسامة بن زید) لە بەردەرگا بوو، سەری بەر لاتەنیشتی دەرگاکە کەوت و سەری بریندار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە منی فەرموو، تا سەری بسڕم، بەڵام من نەمتوانی، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی سەری بۆ سڕی و پاکی کردەوە.

ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وڵاخێک بوو، دەچوو بۆ سەردانی (سعد بن عبادة)، (أسامة بن زید)یش لەدوایەوە لەگەڵیدا سەرکەوتبوو، دای بە لای کۆڕێکدا کە موسڵمان و جوولەکە و بتپەرستیشی تێدابوو، (عبد الله بن أبي بن سلول)یش

لەویّ بوو، هەروەها (عبدالله بن رواحة)ش لەویّ بوو، کاتێک تەپوتۆزی وڵاخەکە بەر کۆڕەکە کەوت، (عبد الله بن أبي بن سلول) لووتی خۆی بە عەباکەی داپۆشی، ئینجا وتی: تۆزمان بەسەردا مەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی بۆ کردن و دواتر وەستا و بانگی کردن بۆ لای خوا و قورئانی بەسەریاندا خوێندەوە، (عبد الله بن أبي بن سلول) کە گەورەی مونافیقەکان بوو وتی هۆ کابرا، ئەوەی تۆ دەیڵێیت، ئەگەر حەق بێت لەوە باشتر نییە، دەی ئیتر لە مەجلیسەکانماندا بێزارمان مەکە، بڕۆرەوە بۆ شوێنی خۆت، هەرکاممان هات بۆ لات بۆی بخوێنەرەوە و قسەی خۆتی بۆ بکە، (عبدالله بن رواحة) کە هاوەڵێکی چاکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەرە مەجلیسمان ئێمە دڵخۆشین بەوە، موسڵمان و بێباوەڕ و جوولەکەکان بەینیان شلۆق بوو، خەریک بوو بدەن بە یەکدا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئارامی کردنەوە، ئینجا سواری وڵاخەکەی بوویەوە، چوو بۆ لای (سعد بن عبادة).

**پەند و وانە:**

هەمیشە کەسانێک هەن کە  بە قسەی خێر و چاک بێتاقەت دەبن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە ئەو کەسانە دڵیان نەخۆشە و حەزیان لە پاکی و جوانی نییە، بەرانبەر بەوەش کەسانێک هەن تامەزرۆن قسەی چاک و بەسوود ببیستن، چونکە دەزانن هەمیشە چاکە براوە دەبێت، پێویستە ئێمە لەوانە بین کە تامەزرۆی قسەی چاک و خێرن.

لە جەنگی بەدردا (أسامة) نەچوو بۆ جەنگەکە و لەگەڵ (عثمان بن عفان)دا مایەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردبوو ئەو دووانە لای (رقیة)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ)بن کە نەخۆش بوو، ئەوەبوو (رقیة) وەفاتی کرد، (أسامة) لەگەڵ (عثمان)دا سەرقاڵ بوو بە ئەسپەردەکردنی تەرمی (رقیة)وە، لەو کاتەدا (عثمان) دەنگی (اللهأکبر)ی بیست، وتی (أسامة) ئەوە چییە؟ کە  چوون سەیریان کرد (زید)ی باوکی (أسامة)یە موژدەی شکستی بێباوەڕانی هێناوە.

لە جەنگی ئوحوددا (أسامة) چوو، تا بەشداری جەنگەکە بێت، بەڵام لەبەر کەمی تەمەنی، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا بەشدار بێت.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ حەج، (أسامة)ش بەشداری کرد و بە جلەکەی سێبەری دەکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، تا لە

گەرما بیپارێزێ.

(أسامة بن زيد) دەڵێت ڕۆژێک لە جەنگێکدا لەگەڵ موسڵمانێکدا گەیشتین بە بێباوەڕێک کە شمشێرمان لێهەڵکرد وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله)، بەڵام ئێمە وازمان لێنەهێنا و کوشتمان، کاتێک هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) مەسەلەکەمان بۆ باسکرد، فەرمووی ئەی (أسامة) ئەی چی ئەکەیت بە (لا إله إلا الله (**يا أسامة من لك بلا إله إلاّ الله**))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لەبەر ترس وای وت، تا نەیکوژین.

فەرمووی: ئەی (أسامة) ئەی چی ئەکەیت بە (لا إله إلا الله)، (أسامة) دەڵێت: وتم: بەڵێن ئەدەم بەخوا ئیتر هەرگیز کەسێک نەکوژم کە بڵێت: (لا إله إلا الله).

**پەند و وانە:**

پێویستە زۆر وریا بین لە خۆمانەوە خەڵک بە بێباوەڕ، یان دووڕوو تەماشا نەکەین و گومانمان بەرانبەر بە خەڵکی باش بێت، چونکە خوای گەورە لە ئێمە زاناترە بە کەسەکان و زۆر شت هەن ئێمە نایانزانین و نایانبینین، لەوانەیە ئەو کەسەی ئێمە بە ئیمان لاوازی دەزانین، لای خوای گەورە زۆر چاکەکار و خواناس بێت.

کاتێک (**فاطيمة** بنت أبي الاسد) دزی کرد و بڕیار درا سزا بدرێت، کەس و کار و هۆزەکەی هاتن بۆ لای (أسامة)، تا لای

پێغەمبەر(ﷺ) پاکانەیان بۆ بکات، کاتێک (أسامة) ویستی قسەی لەسەر بکات، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێ نەدا و تێیگەیاند ئەوە سنووری خوایە، ئەگەر بۆ (**فاطمة**)ی کچی خۆیشی بێت جێبەجێی دەکات.

**پەند و وانە:**

نابێت هەوڵ بدەین جیاوازی چینایەتی دروست بکەین و لەبەر خزمایەتی مافی کەسێک بخۆین، بەڵکو دەبێت هەرچی حەق و ڕاستی بوو، ئەوە جێبەجێ بکەین و پشتگیری حەق بین، دەبێت، تەنانەت ئەو کەسەی حەقی لایە کەسمان نەبێت و کەسەکەی تر خزممان بێت، چونکە ئەگەر هەمووان وا بکەن ئیتر ستەم نامێنێت و کۆمەڵگە خۆشی و بەختەوەری دەیگرێتەوە.

لە فەتحی (مکة)دا، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ناو کەعبە یەکێک لەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) چوونە ژوورەوە (أسامة بن زید) بوو، لەوێ بتەکان شکێنران و کەعبە لە بتەکان پاک کرایەوە.

لە جەنگی حونەیندا کاتێک سەرەتا موسڵمانان شکستیان خوارد و ڕایانکرد، بڕێ لە هاوەڵان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ)مانەوە، یەکێک لەوانەی مایەوە و بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، (أسامة بن زید) بوو.

**پەند و وانە:**

دەبێت لە ساتە سەختەکاندا وریای هەڵوێستمان بین و ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە لە ساتە سەختەکاندا هەر هەنگاوێک دەبێتە هۆی یەکلاکردنەوەی ناڕەحەتییەکان، لەوانەیە بە خۆڕاگرییەکی ئێمە هەموو ئەو سەختی و ناڕەحەتییانە نەمێنن و سەرکەوتن بەدەست بهێنین.

پێغەمبەر(ﷺ) لەپێش وەفاتیدا بڕیاری دا هێرش ببات بۆ سەر ڕۆمەکان، بۆ ئەوەش سوپایەکی پێکهێنا کە هاوەڵانی وەک (عمر بن الخطاب)یشی تێدابوو، (أسامة)ی بانگ کرد و کردی بە بەرپرسی ئەو سوپایە، ئەوکات هێشتا تەمەنی (أسامة) نزیکەی، بیست ساڵ دەبوو، بەڵام لەو ماوەدا پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش کەوت، بۆیە (أسامة) نەچوو بۆ جەنگەکە، دواتر کە(أبوبکر) بوو بە خەلیفە، (أسامة)ی بانگ کرد و داوای لێکرد فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بەجێ بگەیەنێت و بچێت بۆ جەنگەکە، (أسامة)ش هێرشەکەی برد و توانی سەرکەوتنێکی باش بەدەست بهێنێت.

## پەند و وانە:

لێهاتوویی و بەهێزی بە بچووکی و تەمەن نییە، نابێت هیچ کات توانای کەس بە کەم بگیرێت، دەبێت گەورەکان هەوڵ بدەن توانای کەسە کەم تەمەنەکان بخەنەکار، چونکە زۆر جار ئەو کەسانە دەتوانن خزمەتی گەورە پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن.

(أسامة) لای (أبوبکر) و (عمر) و هەموو موسڵمانانی تریش زۆر خۆشەویست بوو، بۆیە کاتێک (عمر) بوو بە خەلیفە و

مووچەی بۆ خەڵکی دیاری کرد، مووچەکەی (أسامة) زۆر زیاتر بوو لە مووچەکەی، (عبدالله)ی کوڕی خۆی، (عمر) دەیوت: چونکە باوکی (أسامة) لە باوکی (عبدالله) لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستتر بوو، (أسامة)ش لای پێغەمبەر(ﷺ) لە (عبدالله) خۆشەویستتر بوو.

هەروەها (أسامة) فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیست و دواتر دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵانی تر و موسڵمانانی ئەو سەردەمە و ئەوانیش فەرموودەکانیان بۆ کەسانی تر گێڕایەوە، تا ئەمڕۆ ئەو فەرموودانە بۆ ئێمەش ماونەتەوە.

**پرسیار:**

١- (أسامة)و باوکی بە چی ناسرابوون؟

٢- خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (أسامة) باس بکە.

٣- بۆچی (أسامة) لە جەنگی بەدر و ئوحوددا بەشداری نەکرد؟

٤- بۆچی (أسامة) نەچوو بۆ ئەو هێرشەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد؟

٥- (عمر) سەبارەت بە (أسامة) چی وت؟

## ٧- (براء بن عازب)(رضي الله عنه)

لە شاری (مدینة)دا منداڵێکی ڕۆح سووک، ژیر و زیتەڵ هەبوو، بە ناوی (براء بن عازب) کە هێشتا تەمەنی کەم بوو، هەم خۆی و هەم باوک و دایکیشی موسڵمان بوون و هەموویان پێغەمبەری خوایان دەبینی و لەگەڵی دەژیان، (براء) چوار برا و خوشکێکیی هەبوو کە هەموو ئەوانیش موسڵمان بوون، ئەوەش ڕەحمێکی خوا بوو بۆ ئەو خێزانە، تا هەموویان موسڵمان بن و دوور بگرن لە بتپەرستی.

(براء) کە دواتر گەورە بوو و ژنی هێنا دوو کچ و دوو کوڕی هەبوو، کوڕەکانی فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا بچێت بۆ غەزای بەدر، (براء)یش خێرا خۆی کۆکردەوە و نەوی لە شمشێرێک، تا بەشداری جەنگی دژ بە بێباوەڕان بێت، هاوەڵێکی تریشی لەگەڵ دا بوو بە ناوی (عبدالله بن عمر)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێ نەدان و هەردووکیانی ناردەوە بۆ ماڵەوە.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا ئەو دوو هاوەڵە بەشداری غەزای بەدر بکەن؟

وەڵام: چونکە هەردووکیان تەمەنیان کەم بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێی نەدەدا ئەوانەی تەمەنیان کەمە لە جەنگدا بەشداری بکەن.

پەند و وانە:

پێویستە گوێڕایەڵی کەسی گەورە و زانایانمان بکەین کاتێک ڕێنماییان کردین بۆ کارێک کە لە وانەیە خۆمان پێمان ناخۆش بێت، بەڵام حەق و ڕاستی لەوەدایە کە گوێڕایەڵیان بین، وەک چۆن (براء) و (عبدالله بن عمر) گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و گەڕانەوە و نەچوون بۆ جەنگەکە.

دوای ماوەیەکی زۆر جارێکی تر بڕیاری جەنگ درا دژ بە بێباوەڕان، چونکە بێباوەڕانی قوڕەیش بە نیاز بوون هێرش بهێننە سەر شاری (مدینة)، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد خەڵکی خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرگری، تا جەنگی ئوحود بکەن، (براء)یش ویستی، ئەمجارەیان بەشداری بکات، بەڵام هێشتا تەمەنی زۆر نەبوو و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد بچێتەوە بۆماڵەوە.

بەڵام لە کاتی جەنگی خەندەقدا ئیتر تەمەنی (براء) زۆر بوو و پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا بەشداری بکات، (براء) هاوشانی هاوەڵانی تر لە هەڵکەندنی خەندەقەکەدا بەشداری کرد و خۆڵی دەگواستەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بەشداری کرد، (براء) دەڵێت: پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەگەڵ ئێمەدا خۆڵی دەگواستەوە، خۆڵ سەر سکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) داپۆشیبوو.

**پەند و وانە:**

دەبێت هیچ کام لە ئێمە خۆبەزلزان نەبێت، تا دەتوانێت خاکی بێت، چونکە تەنها کەسە نەفامەکان خۆیان بە گەورە دەزانن، هەروەها دەبێت سەرکردەکان وەک پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری ئەرک و نارەحەتی هاوڵاتیانیان بن، نەوەک خۆیان لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بن و هاوڵاتیانیش لە ژیانی سەخت و ئیش و کاری قورسدا بژین.

(براء بن عازب) ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەری هەڵکەندنی خەندەقەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا بەردێکی گەورەمان هاتەڕێ کە بە هیچ نەدەشکا، سکاڵا برایە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش هات، جلەکەی سەرشانی دانا و دواتر دابەزی، پاچەکەی(زەنگنەکەی) گرت و فەرمووی: (بسم اللە)، دای لە بەردەکە سێ یەکی بەردەکە

شکا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله أکبر) کلیلەکانی شامم پێ درا، سوێند بەخوا وا لەم شوێنەمەوە کۆشکە سوورەکانی دەبینم، ئینجا فەرمووی: (بسم الله) و دانەیەکی تری لێدا، سێ یەکی تری بەردەکە شکا، فەرمووی: (الله اکبر) کلیلەکانی فارسم پێ درا، سوێند بەخوا وا مەدائین دەبینم و کۆشکە سپیەکەی لەم شوێنەمەوە دەبینم، پاشان فەرمووی: (بسم الله) و دانەیەکی تری لێدا پاشماوەکەی تری شکاو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله أکبر) کلیلەکانی (یمن)م پێ درا، سوێند بەخوا وا لەم شوێنەمەوە دەرگاکانی (صنعا) دەبینم.

ئەمەش موژدەیەکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان کە لەو کاتە سەختەدا چاوەڕێی ئەوە بوون هەر دەقە و ساتێک دوژمن هێرش بباتە سەریان، کەچی موژدەیان پێدرا وڵاتی شام و فارس و (یمن) دەکەوێتە دەستیان.

(براء بن عازب) زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەسەر دەبرد، ئەوەتا دەڵێت: لە هەژدە دەرچوونی پێغەمبەردا(ﷺ) هاودەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووم.

(براء بن عازب) لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا بەشداری کرد، بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە ڕۆژی (الحدیبیة)دا

سەد و چواردە وشترمان پێ بوو، (الحديبية)ش بیرێک بوو، لەوێ لاماندا و چی ئاوی تێدا بوو دەرمانکرد، تا هیچی تیا نەما، پێغەمبەر(ﷺ) لە لێواری بیرەکەوە دانیشت و داوای بڕێک ئاوی کرد، ئاوەکەیان بۆ هێنا و بڕێکی خستە دەمی و لە دەمی ڕادا، دواتر ئاوەکەی ناو دەمی کردە ناو بیرەکەوە، چاوەڕێمان کرد هێندەی نەبرد خۆمان تێر ئاومان لێ خواردەوە و دواتریش وڵاخەکانمان تێر ئاو کردن.

ئەمەش (معجزة)یەک بوو کە خوای گەورە بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ) و هیچ کەسێکی تر توانای ئەوەی نییە بیکات، تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) بە بێ ویستی خوا نەی ئەتوانی ئەوە بکات، بەڵام خوای گەورە تایبەت ئەو (معجزة)ی بە پێغەمبەرەکەمان بەخشی.

(براء بن عازب) دەڵێت: جارێک پێغەمبەرم(ﷺ) بینی (حسن)ی لە قەڵادۆشکانی دانابوو و دەیفەرموو: (خوایە، من خۆشم ئەوێت، دەی تۆیش خۆشت بوێ).

(براء بن عازب) دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) بەردەوام بوو لە غەزاکاندا، لە هەر کوێ جەنگی دژ بە بێباوەڕان بکرایە، خێرا بەشداری تێدا دەکرد.

دواتر (براء)ماڵی گواستەوە و چوو لە شاری (کوفة)

نیشتەجێ بوو و هەر لەوێ ژیا، تا دواجار لەوێ وەفاتی کرد.

## پرسیار:

١- لە ناو خێزانی (براء)دا چەند کەسیان موسڵمان بوون؟

٢- بۆچی (براء) لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری نەکرد؟

٣- ڕووداوی بەردە گەورەکە چۆن بوو؟

٤- باسی ڕووداوی بیرەکەی (حديبية) بکە.

## ٨- (سعد بن معاذ)(رضي الله عنه)

پشتیوانان لە (مدینة)دا دوو بەش بوون، بەشێکیان ناسرابوون بە ئەوسیەکان، بەشێکی تریشیان ناسرابوون بە خەزرەجیەکان، جا گەورە و پیاوماقووڵی ئەوسیەکان کەسێک بوو بە ناوی (سعد بن معاذ).

جارێک (أسعد بن زرارة) (مصعب بن عمیر)ی برد، تا باسی ئیسلام بکات بۆ خەڵکی، بەڵام (سعد بن موعاذ) و (أسید بن حضیر) کە گەورەی هۆزەکانیان بوون و هێشتا موسڵمان نەبووبوون، ئەومیان پێ ناخۆش بوو و ویستیان ڕێیان پێ نەدەن، (أسعد) بە (مصعب)ی وت: ئەگەر ئەمانە موسڵمان بن خەڵکێکی زۆر بەهۆیانەوە موسڵمان دەبێت، (مصعب)یش بە جوانی باسی ئیسلامی کرد بۆیان و ئەوانیش موسڵمان بوون و بەهۆی ئەوانیشەوە خەڵکێکی زۆری ناو (مدینة) هاتنە ناو ئیسلامەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان (سعد بن أبي وقاص) و (سعد بن معاذ)ەوە.

(سعد) هەر لە کۆنەوە لەگەڵ (أمیة بن خلف) پەیوەندی و دۆستایەتی هەبوو، (أمیة) یەکێک بوو لە سەرکردەکانی بێباوەڕان، کاتێک (أمیة) دەچوو بۆ شام، لە (مدینة)وە دەچوو و لەوێ لای (سعد) لایدەدا، (سعد)یش جار جار کە دەچوو بۆ (مکة) لای (أمیة) لایدەدا، جارێک (سعد) چوو بۆ (مکة) بۆ عومرەکردن، چوو بۆ لای (أمیة بن خلف)، (أمیة) پێی وت: چاوەڕێکە، تا نیوەڕۆ دادێت و خەڵکی دەچنەوە ماڵ و چۆڵ دەبێت، ئینجا بڕۆ تەوافەکەت بکە، (سعد)یش وایکرد، کاتێک لە تەوافدا بوو (أبوجهل) هات و وتی: ئەوە کێیە وا بێ خەم تەواف دەکات؟ (سعد) وتی: منم (سعد).

ئەویش وتی: وا بێ خەم تەواف دەکەیت لە کاتێکدا پەنای (محمد) و هاوەڵانیتان داوە؟

وتی: بەڵێ.

ئیتر کەوتنە دەمەقاڵێ، (أمیة) بە (سعد)ی وت: دەنگت بەرز مەکەرەوە بەسەر (أبو الحكم)دا، چونکە ئەو گەورەی ناوچەکەیە.

(سعد) وتی بەخوا، ئەگەر ڕێم لێ بگریت ڕێی کاروانی بازرگانیت بەرەو شام دەبڕم. (أمیة) هەر دەیوت دەنگت بەرزمەکەرەوە.

(سعد) تووڕە بوو و پێی وت: بیستوومە لە (محمد) کە دەیوت تۆ دەکوژێت، (أمیة) وتی من؟

وتی: بەڵێ، (أمیة)، وتی: (محمد) ئەهلی درۆ نییە، ئیتر گەڕایەوە بۆماڵەوە و بە ژنەکەی وت: دەزانیت هاوڕێکەی (مدینة)م پێی وتم: بیستوویەتی لە (محمد) وتوویەتی من دەکوژێت؟! ژنەکەشی وتی بەخوا (محمد) درۆ ناکات، ئەوەبوو کەدواتر (أمیة) چوو بۆ جەنگی بەدر، ژنەکەی پێی وت: بیرت نایەت هاوڕێکەی (مدینة)ت چی پێ وتیت؟ (أمیة) کە بیری کەوتەوە ویستی نەچێت بۆ جەنگەکە، (أبو جهل) پێی وت: تۆ سەرگەورەی خەڵکەکەیت، هیچ نەبێ ڕۆژێ دووان وەرە لەگەڵ مان، (أمیة)ش چوو، ئەوەبوو لە جەنگی بەدر کوژرا.

(سعد) لە غەزای بەدردا بەشداری کرد، لەو غەزایەدا ئاڵای ئەوسیەکان بەدەست ئەوەوە بوو، (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ شوێن حەوانەیەکت لە دواوە بۆ دروست نەکەین، تا تیایدا بیت و ئێمەش جەنگی دوژمن بکەین؟، ئەگەر خوا سەری خستین ئەوە باشتر، ئەگەرنا تۆ بگەڕێرەوە (مدینة)،

چونکە خەڵکێک بۆیان نەکراوە بێن، هێندەی ئێمە تۆیان لا خۆشەویستە و بیانزانیبا جەنگ دەکەیت هەرگیز دوانەدەکەوتن و دەهاتن لەگەڵت و سەریان دەخستیت، پێغەمبەر(ﷺ) سوپاسی کرد و نزای خێری بۆ کرد.

دواتریش کە غەزاکە تەواو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ناو چادرەکەی، (سعد) هاودەم بە ژمارەیەک لە پشتیوانان لەبەر دەرگای چادرەکە بە شمشێرەوە وەستا و پاسەوانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد نەبادا دوژمن کتوپڕ هێرشی هەڵگەڕاوە بهێنێت.

هەروەها (سعد) یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای ئوحود، کاتێک خەڵکی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) تەکینەوە (سعد) یەکێک بوو لەوانەی لە دەوری مایەوە.

دواجار (سعد) لە دوای غەزای خەندەق و لە جەنگی دژ بە جوولەکەکاندا بریندار بوو و بە هۆی برینەکەیەوە شەهید بوو.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای (سعد)، باوەشی پێدا کرد و خوێن بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) دەچۆڕا کە(أبوبکر) هات و ئەوەی بینی وتی: وەی پشتی شکاوم.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وس ئەی (أبوبکر)، ئینجا (عمر) هات کەئەو حاڵەی بینی وتی: (إنا لله و إنا إليه راجعون).

کاتێک (سعد) وەفاتی کرد، دایکی دەستی کرد بە گریان و قیژە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: (ئەرێ ئیتر بۆچی فرمێسکت ناوەستێنیت و خەفەتت لانابەیت، خۆ کوڕەکەت یەکەم کەسە خوا بۆی پێکەنی و عەرشی خوا بۆی لەریەوە).

پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ناو گۆڕەکەی (سعد) و ماوەیەک مایەوە و دواتر هاتە دەرەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی وا مایتەوە تیایدا؟ فەرمووی: (سعد) لە گۆڕدا گوشرانێک دەگوشرا، منیش داوام لە خوا کرد، ئەوەی لەسەر لابرد).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پاش مەرگی (سعد بن موعاذ) فەرمووی: (عەرشی پەروەردگار بۆ مەرگی (سعد بن موعاذ) لەرزی). (أنس بن مالك) دەڵێت: جارێک جبەیەکی چاک و ناوازە بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، خەڵکی زۆر پێی سەرسام بوون. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەوەی گیانی (محمد)ی بەدەستە دەستەسڕەکەی (سعد بن موعاذ) لە بەهەشتدا زۆر لەوە باشترە).

**پرسیار:**

١- (سعد) چۆن موسڵمان بوو؟

٢- بەسەرهاتی (سعد) و (أمية)ی چۆن بوو؟

٣- ڕۆڵی (سعد) لە غەزای بەدردا باس بکە.

٤- کە (سعد) شەهید بوو پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرموو بە دایکی؟

٥- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەک لە ناو گۆڕەکەی (سعد)دا مایەوە؟

## ٩- (عبدالرحمن بن عوف)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە موژدە پێدراوانی بەهەشت هاوەڵێکی خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بە ناوی (عبدالرحمن بن عوف)، یەکێکیشە لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ)، تا وەفاتی کرد لێی ڕازی بوو.

(عبدالرحمن) سەرەتا ناوی (عبد عمر)، یان (عبدالكعبة) بوو، بەڵام کە موسڵمان بوو پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا (عبدالرحمن).

(عبدالرحمن) دە ساڵ لە پێغەمبەر(ﷺ) بچووکتر بوو.

پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە ماڵی (أرقم) و لەوێ بانگەواز بکات، (عبدالرحمن) هاودەم بە چەند کەسێکی تر چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی ئیسلامی کرد و وردەکارییەکانی ئیسلامی خستەڕوو بۆیان، ئەوانیش موسڵمان بوون.

(عبدالرحمن) یەکێکە لە بەشداربووانی کۆچی (حبشة) و لە هەردوو کۆچەکەدا بەشداری کرد، دواتر گەڕایەوە بۆ (مكة) و لەوێوە کۆچی کرد بۆ (مدينة).

کاتێـک پێغەمـبەر(ﷺ) لە (مدینـة) برایەتـی خسـتە نێـوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان (سعد بن ربیع) و (عبدالرحمن بن عوف)ەوە.

(عبـدالرحمن) کە سـەرەتا هـاتە (مدینـة) کەسێکی هەژار و نەدار بوو، هیچی نەبوو، (سعد)یش کەسێکی دەوڵەمەند بـوو، بە (عبـــدالرحمن)ی وت: مـــاڵەکەم لەگەڵتـــدا دووکەرت دەکەم و ژنێکیشت لـێ مـارە دەکەم، ئەویـش وتـی: خـوای گەورە بەرەکەت بخاتە ژن و ماڵتەوە، ڕێی بازاڕم نیشان بدەن دەبێت بچم کاسبی بکەم.

**پەند و وانە:**

کەسـی موسـڵمان دەبێـت هەوڵ بـدات خـۆی بژێـوی ژیـانی خۆی پەیدا بکات، تا ناچار نەبێت یـارمەتی لە خەڵکـی تـر داوا بکـات، چـونکە خـوای گەورە توانـای بە ئـادەمیزاد بەخشـیوە و هانیشی داوە، تـا کـار بکەن، خوا و پێغەمـبەری خواش کەسـی ئیشکەر و کاسبیان خۆشدەوێت.

(حـارث) کە یەکێـک بـوو لە هـاوەڵان، دەڵێـت: کاتێـک پێغەمـبەر(ﷺ) لە شـیوەکە بـوو سـەبارەت بە (عبـدالرحمن بـن عوف) پرسیاری لێکـردم و هەواڵـی ئەوی پرسی، منـیش وتـم: وا لە لاپاڵی شاخەکەوەیە، بینیم دەستەیەکی دوژمـن هـاتبوون بۆی

و منیش ویستم بچم بۆ پاڵپشتی ئەو، بەڵام کە تۆم بینی هاتم بـۆ لای تـۆ، پێغەمـبەریش(ﷺ) فەرمـووی: (چـاک بـزانە فریشتەکان لەگەڵ ئەودا دەجەنگن و پاڵپشتی دەکەن). (حارث) دەڵێت: منـیش گەڕامەوە بـۆ لای (عبـدالرحمن) و بینـیم لە نێـو حەوت لاشـەی کـوژراودایە، پـێم وت: نەڵێیـت هەمـوو ئەمـانەت کوشـت؟ وتـی: ئەمەیـان (أرتئـة) کوشـتی، ئەم دوانەش مـن کوشـتنم، بەڵام ئەمـانەی تـر بەدەسـتی کەسـانێک کـوژران کە نەمدەبینین، منیش وتم: خوا و پێغەمـبەرەکەی ڕاستیان فەرمـوو، ئەوە فریشتەکانی خوا بوون.

(عبـدالرحمن) لە ڕێککەوتنـی حودەیبیەشدا بەشداری کـرد و یەکێک بوو لە شاهیدەکانی ڕێککەوتنەکە.

(عبدالرحمن بن عوف) یەکێکە لە موژدە پێدراوانی بەهەشت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (أبوبکر) لە بەهەشتە، (عمر) لە بەهەشـتە، (عثمـان) لە بەهەشـتە، (علـي) لە بەهەشـتە، (طلحـة) لە بەهەشـتە، (زوبیـر) لە بەهەشـتە، (عبـدالرحمن بـن عوف) لە بەهەشتە، (سعد) لە بەهەشتە، (سعید) لە بەهەشتە، (أبوعبیدة بن الجراح) لە بەهەشتە).

هەروەهـا پێغەمـبەر(ﷺ) لە دوای (عبـدالرحمن بـن عـوف)ەوە نـوێژی کـردووە، ئەو فەزڵەش خـوا تەنهـا بە (أبـوبکر الصدیق) و

(عبدالرحمن بن عوف)ی بەخشی، (مغیرة بن شعبة) کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە. دەڵێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، دەمی بەیان پێغەمبەر(ﷺ) لە خەڵکەکە دوورکەوتەوە و منیش بەدوایدا چووم و لە دووریەوە چاوەڕوان بووم کە هاتەوە فەرمووی کارت هەبوو ئەی (مغیرة)؟

وتم: نا. فەرمووی ئایا ئاوت پێیە؟

وتم: بەڵێ.

دەستنوێژێکی تەواوەتی گرت کەگەیشتینەوە بە خەڵکەکە نوێژ دابەسرابوو، (عبدالرحمن بن عوف) بەرنوێژی دەکرد، ڕکاتێکی کردبوو و لە ڕکاتی دووەمدا بوو، ویستم بڕۆم بە (عبدالرحمن) بڵێم: دەست هەڵگرێت ئەوە پێغەمبەری خوایە،(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێکردم، ئێمەش ئەو ڕکاتەمان لە دوایەوە کرد و دوای سەلامدانەوەی (عبدالرحمن) ڕکاتەکەی ترمان تەواو کرد.

(عبدالرحمن) دەڵێت: جارێک چوومە مزگەوت و پێغەمبەر(ﷺ) لەوێ نەبوو، منیش کەوتمە دوای پێغەمبەر(ﷺ)، تا بینیم چوویە ناو باخە خورمایەک و ڕوویکردە قیبلە و سوجدەیەکی دووردرێژی برد، منیش وەستابووم، وامزانی وەفاتی کردووە، چوم بەرەو لای، سەرم نزم

کردەوە و سەیرێکی دەموچاویم کرد، پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: چییە ئەی (عبدالرحمن)؟

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە سوجدەکەت درێژ کردەوە ترسام وەفاتت کردبێت بۆیە هاتم تەماشام کردیت.

فەرمووی: (من کە هاتمە ناو باخە خورماکە گەیشتم بە (جبریل) و ئەویش فەرمووی: موژدەت پێدەدەم خوا دەفەرموێت هەرکەس سەلامت لێ بکات سەلامی لێدەکەم و هەرکەس صەڵەواتت لەسەر بدات صەڵەواتی لەسەر دەدەم).

**پەند و وانە:**

پێویستە ڕۆژانە و بەردەوام صەڵەوات بدەین لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە صەڵەوات دان پاداشتی زۆری هەیە، خوای گەورەش صەڵەوات دەنێرێت بۆ ئەو کەسە و لە ڕۆژی دواییشدا پاداشتی گەورەی لەسەرە.

جارێک (عبدالرحمن بن عوف) نیوەی سامانی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە نیوەی سامانەکەمە و هێناومە بۆت و نیوەکەی تریم هێشتوەتەوە بۆ ماڵ و منداڵم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (خوا بەرەکەت بخاتە ئەوەی بەخشیوتە و ئەوەشی هێشتووتەتەوە).

پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، (عبدالرحمن بن عوف)

یارمەتی زۆری خێزانەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەدا و پارەیەکی زۆری دابەش دەکرد بەسەریاندا.

(أبوبكر الصديق) دژ بە هەڵگەڕاوەکان جەنگی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر (مدينة) دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری (مدينة)دا دانا و بڕێک کەسی کرد بە ئەمیری دەستە دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش (علي بن أبو طالیب) و (زوبیر) و (عبدالرحمن بن عوف) و (طلحة) و (سعد بن أبي وقاص) و (عبدالله بن مسعود).

(عبدالرحمن بن عوف) لە سەردەمی هەریەک لە (أبوبكر الصديق)و (عمر بن الخطاب)دا فەتوای بۆ خەڵک دەدا و وەڵامی دروستی پرسیارەکانی خەڵکی دەدایەوە.

جارێک کاروانێکی بازرگانی هاتنە (مدينة)، (عمر بن الخطاب) کە خەلیفە بوو بە (عبدالرحمن بن عوف)ی وت: با ئەمشەو پاسەوانی ئەمانە بکەین، ئەویش وتی باشە، ئەو شەوە (عمر) و (عبدالرحمن) پێکەوە پاسەوانی ئەو کاروانەیان کرد.

لەو نوێژەدا کە (عمر بن الخطاب) بە دەستی (أبو لؤلؤة المجوسي) شەهید کرا، خەلیفە خێرا فەرمانی کرد (عبدالرحمن بن عوف) نوێژەکەی، بۆ خەڵکەکە کرد، پاشان (عبدالرحمن)ی بانگ کرد و وتی: دەمەوێت تۆ ڕاسپێرم، تا دوای من ببیتە

خەلیفە، (عبدالرحمن) ڕازی نەبوو، بۆیە خەلیفە (عمر) شەش کەسی دانا، تا خۆیان کەسێک دیاری بکەن.

جارێک (عبدالرحمن بن عوف) وەسیەتی کرد چی بەشداربووی بەدر ماون دیاری بکرێن، تا هاوکارییان بکات، تەنها سەد کەس مابوون، بۆ هەرکامیان چوارسەد دیناری پێ بەخشی.

دواجار (عبدالرحمن) لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدا لە (مدینة) کۆچی دوایی کرد و خەلیفە (عثمان) نوێژی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا.

**پرسیار:**

١- (عبدالرحمن) داوای چی کرد لە (سعد)؟

٢- بەسەرهاتی بەرنوێژیەکەی، (عبدالرحمن) چۆن بوو؟

٣- باسی بەخشندەیی (عبدالرحمن) بکە.

٤- پاداشتی صەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) چیە؟

٥- چوار پەند و وانە لە ژیانی (عبدالرحمن) باس بکە.

## ١٠- (جبیر بن مطعم)(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی باسی دەکەین دانیشتووی (مکة) بوو، یەکێک بوو لە قورەیشیەکان، ناوی (جبیر) بوو، یەکێک بوو لە کەسە ژیر و خانەدانەکانی ناو قورەیش و سەبارەت بە ڕەچەڵەکی عەرەبیش پرسیاری لێ دەکرا، چونکە لەو بوارەدا شارەزایی زۆری هەبوو.

پرسیار: (جبیر) لە (مکة) سەرقاڵی چی بوو؟

وەڵام: (جبیر) سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو و هەندێ جار لەبری خۆی کەسی تری دەنارد، تا کاری بازرگانی بۆ بکات.

کاتێک بێباوەڕانی قورەیش لە (مکة) گەمارۆی ئابووری و کۆمەڵایەتییان خستەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی، بەڵام (جبیر) لەو ماوەدا بە نهێنی سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکەکەی دەکرد و دواتریش یەکێک بوو لەوانەی بەشدار بوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو گەمارۆیەدا.

**پەند و وانە:**

پێویستە هەر موسڵمانێک لە پێناو ئایینەکەی و سەرخستنی ڕاستیدا بەرگەی نارەحەتییەکان بگرێت و دەستبەرداری حەق نەبێت، ئەوەش بزانێت کە خوای گەورە دەرگای ڕزگاربوونی لێ دەکاتەوە و هەم خۆشی ڕووی تێدەکات و هەم پاداشتی ڕۆژی دواییشی بۆ دەمێنێتەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ (طائف) و بانگەوازی خەڵکەکەی کرد و خەڵکەکە باوەڕیان نەهێنا و ئەویش گەڕایەوە، (جبیر) پەنای پێغەمبەری خوای(ﷺ) دا، تا تەوافی عومرەی کرد.

(جبیر) لە جەنگی بەدردا بە بێباوەڕی بەشداری کرد، خۆی دەڵێت: لە بەدردا پێش ئەوەی شکست بخۆین بڕێ شتم دەبینی لە ئاسمانەوە وەک مێروولەی سپی دادەبەزین، گومانم نییە ئەوانە فریشتە بوون.

**پەند و وانە:**

ئەگەر موسڵمانان لەگەڵ خوادا ڕاست بکەن، ئەوە خوای گەورە یارمەتی موسڵمانان دەدات، وەک چۆن لە غەزای بەدردا فریشتەی ناردە خوارەوە بۆ پشتیوانی موسڵمانان، هەروەها

فریشتەکان ڕۆژانە نزای خێر دەکەن بۆ کەسی موسڵمان و داوا لە خوا دەکەن ئەو کەسە بخاتە بەهەشتەوە.

(جبیر) هەر بە بێباوەڕی مایەوە، تا دوای فەتحی (مکة)، ئەوکات موسڵمان بوو.

(جبیر) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد، بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم کە لە حونەین دەگەڕایەوە و خەڵکی لەگەڵیدا بوون، هەندێک کەسی خێڵەکی کەتازە موسڵمان بووبوون زۆر دەئالأن بە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، تا عەباکەی برا، پێغەمبەر(ﷺ) ناچار لای دارێک وەستا و فەرمووی: (عەباکەمم بدەنەوە، ئەگەر بە هێندەی دارەکانی تیهامە وشترم لا بوایە، بە دڵنیاییەوە دابەشم دەکرد بەسەرتاندا و پیسکە و درۆزن و ترسنۆک نەدەبووم).

**پەند و وانە:**

زۆر جار کەسانێک کە جوان لە ئیسلام تێنەگەیشتوون و سەرەتای موسڵمانبوونیانە، دەکەونە هەندێ هەڵەوە و نەیانتوانیوە جوان لە ڕاستیەکان تێبگەن، زۆر کەس هەن لەم ڕۆژگارەی خۆشماندا چاویان لە دنیایە و هەوڵ دەدەن بە هەر ڕێگەیەک بێت پارە و سامان بۆ خۆیان کۆبکەنەوە، بەڵام دەبێت ئەو کەسانە تێبگەیەنین کۆکردنەوەی سامان ڕێگەی ڕاست و

دروستی خۆی هەیە و نابێت بە ڕێگەی ناشەرعی بکەوینە سامان کۆکردنەوە.

(جبیر) دەڵێت: جارێک لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم، ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە، ئەگەر ڕۆیشتەوە جارێکی تریش بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی: ئەی، ئەگەر هاتمەوە و تۆم نەبینی؟ واتە: ئەگەر مردبوویت، ئەویش فەرمووی: (ئەگەر منت بەدی نەکرد، وەرە بۆ لای (أبوبکر).

(جبیر) لە سەردەمی خیلافەتی (عمر بن الخطاب)دا لە لایەن خەلیفەوە کرا بە والی و بەرپرسی شاری (کوفة) و ماوەیەک لەوێ ئەو بەرپرسیارێتیەی گرتە ئەستۆ.

دواجار (جبیر) لە ساڵی پەنجاو حەوتی کۆچیدا وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

١- (جبیر) لە (مکة) سەرقاڵی چی بوو.
٢- فریشتەکان هەڵوێستیان بەرانبەر بە موسڵمانان چۆنە؟
٣- بەسەرهاتی ئافرەتەکە و پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟
٤- ئایا کۆکردنەوەی سامان دروستە؟
٥- چ پەند و وانەیەک لە ژیانی (جبیر)ەوە فێربوویت؟

## ١١- (خالد بن وليد)(رضي الله عنه)

(خالد بن وليد) يەكێكی تره لە هاوەڵە كۆچەرييەكان كە ناسراوه بە شمشێری خوا، چونكە لە چەندين جەنگ و غەزادا توانيويەتی دوژمن تێكبشكێنێت و پێغەمبەريش(ﷺ) نازناوی شمشێری خوای لێناوه.

باوكی (خالد) كە ناوی (وليد) بوو يەكێك بوو لە كەسايەتييە خانەدانەكانی ناو قورەيش و سامان و داراييەكی زۆريشی هەبوو و بەخشندەييشی زۆر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا يەكێك بوو لە سەرسەختترين نەيارەكانی پێغەمبەر(ﷺ)، كاتێك بێباوەڕان ويستيان هێرشی ڕاگەياندنی دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) بكەن، كۆبوونەوه و لە نێوياندا (وليد) دانيشتبوو كە بە تەمەن بوو، (وليد) وتی: وا وەفدەكانی عەرەب بۆ سەردانی كەعبە دێن، ئەوانەش هەواڵی (محمد)يان بيستووه، جا هەمووتان لەسەر يەك قسە يەكدەنگ بن نەبادا هەركەسە و قسەيەك بكات و يەكتری بە درۆ بخەنەوه.

ئەوانيش وتيان: دەی تۆ بڵێ، چی بڵێين.

ئەویش وتی ئێوە بڵێن، و منیش گوێتان لێ ئەگرم.

یەکێکیان وتی: ئەڵێین کاهینە.

وتی من کاهینم دیوە و دەیانناسم، ئەو کاهین نییە. یەکێک وتی: دەڵێین: شێتە.

وتی: هەموومان شێتمان دیوە و ئەو شێت نییە.

یەکێک وتی: دەڵێین شاعیرە.

(ولید) وتی: ئێمە دەزانین شیعر چۆنە و چیە، ئەو شاعیر نییە.

یەکێک وتی: دەڵێین: جادووگەرە.

وتی: جادووگەریشمان دیوە، ئەو جادووگەر نییە.

دوا پێشنیاز وتی: دەڵێین: ئەمە جادوویەکی پێیە کە برا و برا و باوک و کوڕ و تاک و هۆزەکەی لە یەک دەکات، هەموویان لەسەر ئەو قسە ڕێککەوتن.

(خالد بن ولید) زۆر شێوەی لە (عمر بن الخطاب)دەچوو، تا ئاستێک هەندێ جار کەسانێ (خالد) و (عمر)یان لە یەک جودا نەدەکردنەوە.

(خالد) لە سەردەمی نەفامیدا لەناو قورەیشدا پێگەیەکی گرنگی هەبوو، ئەویش بریتی بوو لە بەرپرسیارێتی سەربازی، هەریەک لە ئامادەکاری سەربازی و مەشق و ڕاهێنان و هەروەها لە جەنگیشدا پێشڕەوی سوارەکانی بە دەستەوە بوو، ئیتر بەو

هـۆیەوە هەمـوو گرنگـی خـۆی دەدا بە بـواری سـەربازی و لەو بوارەدا زۆر هەڵکەوتە بوو.

لە جەنگی ئوحوددا (خالد) سەرکردایەتی سوارەی بێباوەڕانی دەکـرد کە نزیکەی،سـەد سـوارە بـوون، ئەمـانە بەرەی ڕاسـتی سـوپاکە بـوون، کاتێـک تیرهاوێژەکـانی موسـڵمانان کێوەکەیـان چۆڵکرد، (خالد) تەماشای کرد ژمارمیەکی زۆر کەم ماونەتەوە، بۆیە لە پشتەوە هات بۆیان و ئەوانەی کوشت و هێرشی هێنا بۆ موسـڵمانان، کاتێـک بێبـاوەران بینییـان وا (خالـد) لە پشـتووە کەوتـوەتە وڕیـزەی موسـڵمانان گەڕانەوە، بەوە موسـڵمانان کەوتـنە نێـوان دوو بەرەی جەنگـی بێبـاوەرانەوە، ئەم هەڵوێسـتەی (خالـد) شکستی بێباوەڕانی لە ئوحوددا گۆڕی بۆ سەرکەوتن.

لە جەنگی خەندەقیشدا دووبارە (خالد) سەرکردایەتی سوارەی بێبـاوەڕانی دەکـرد، (خالـد) هەر وازی نەدەهێنـا و بە بەشـێک سـوپاوە هەڵیکوتـایە سـەر دەسـتەیەکی موسـڵمانان و مـاوەیەک جەنگ لەنێوانیاندا ڕوویدا و بێباوەران دووبارە شکان.

لە دوای ڕێککەوتنی حودەیبیە کە پێغەمـبەر (ﷺ) چوو بۆ عـومرە، لە (مکة) بە بـراکەی (خالـد)ی فەرمـوو: (خالـد) هـی ئەوە نیـیە خـۆی بـێ ئاگـا بکـات لە ئیسـلام، ئەگەریـش ئەو بەهێـــزی و توانـــایەی لەگەڵ موســـڵمانان دژ بە بێبـــاوەڕان

بەکاربهێنایە باشتر بوو بە دڵنیاییشەوە پێش خەڵکی ترمان دەخست)، (ولید)یش ئەو هەواڵەی دا بە (خالد)، (خالد) کە ئەمەی بیست قسەکە کاری تێکرد و بوویە هۆکاری موسڵمان بوون و کۆچکردنی بەرەو (مدینة).

(خالد) خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێک خوای گەورە خێری هێنایە ڕێم و ئیسلامی خستە دڵمەوە، خۆم بە خۆمم دەوت خۆ من چی جەنگی دژ بە (محمد) هەیە بینیم، چی جاریش چووبم کە گەڕاومەتەوە دەروونم پێی وتوم ئەو کار و شوێنە هی من نییە، (محمد)یش بەمزوانە سەردەکەوێت کە نامەکەی پێغەمبەرم (ﷺ) خوێندەوە گوڕ و تین گرتمی، تا بەرەو ئیسلام بچم، ئینجا کە ویستم بچم بۆ (مدینة) (صفوان بن أمية)م بینی و وتم: وا نازانیت ئێمە لە هەڵەداین، وا (محمد) سەرکەوت بەسەر هەمووواندا، با بچین بۆ لای و شوێنی بکەوین، گەورەیی ئەو بۆ ئێمەشە، بەڵام ئەو زۆر بە سەختی بەرپەرچی دامەوە و وتی: ئەگەر تەنها من مابم شوێنی بکەوم شوێنی ناکەوم. منیش جێمهێشت و وتم: ئەم کابرایە لە بەدردا براکەی کوژراوە، بۆیە وایە. ئینجا ڕێم کەوتە (عكرمة بن أبو جهل) و چیم بە (صفوان) وتبوو بەویشم وت، ئەویش هەمان وەڵامی (صفوان)ی پێ وتم. منیش وتم: دەی ئەم قسانەم لای کەس باس

مەکە، چوومەوە ماڵەوە و فەرمانم کرد سوارەکەم ئامادە کرا و دەرچووم، تا گەیشتم بە (عثمان بن طلحة)، مەسەلەکەم بۆ باس کرد و ئەویش ئامادەبوو بێت. وتم: ئەم ئێوارەیە دەمەوێت دەربچم، ئەوەبوو بۆ بەرەبەیان چووین. لە ڕێگەدا (عمرو بن العاص)مان بینی، ئەویش هاتبوو، تا موسڵمان بێت. چووین تا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).

(خالد) دەڵێت: کە چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ دەزانیت من لە چەند جەنگ و هەڵوێستدا دژایەتیم کردویت، بۆیە لە خوا داوا بکە لەوانەم خۆش بێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە).

منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئەوە بەڵێنم پێبدە کە ئەو نزایەم بۆ بکەیت. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (خوایە، لەهەموو ئەو ڕێگریانەی (خالد) خۆشببە کە خستیە بەردەم ڕێ و بانگەوازەکەت).

ئیتر لەو ساتە بەدواوە (خالد) لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو، دەیویست بە خزمەتکردنی ئیسلام قەرەبووی دژایەتی پێشووی بکاتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە نزیک ماڵی خۆیەوە زەویەکی دانا بۆ (خالد) تا لێوەی نزیک بێت.

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە زۆر جەنگ و هێرشدا (خالد)ی دەکردە سەرکردەی موسڵمانان، ئەویش لە هەموو هێرشەکاندا سەرکەوتوو بوو.

کاتێک لە غەزای موئتەدا هەموو ئەو سەرکردانە شەهید بوون کە پێغەمبەر(ﷺ) دیاری کردبوون، (خالد بن ولید) بوو بە سەرکردە، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) لە (مدینة) بوو، لەسەر مینبەر وتاری دەدا بۆ هاوەڵان، هەواڵی سوپای موسڵمانانی دەدا فەرمووی: ((خالد بن ولید) ئاڵاکەی گرتەدەست، ئەو یەکێک نەبوو لە ئەمیرە دەستنیشان کراوەکان، بەڵکو خۆی ئەمیرایەتی گرتەدەست... خوایە، –(خالد)- شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خۆت، خوایە، لەسەر دەستی سەرکەوتن ببەخشی). ئیتر لەو ڕۆژەوە (خالد) ناوی نرا شمشێری خوا.

(خالد) کە سەرکردایەتی سوپای گرتەدەست یەکەمجار سوپای موسڵمانانی لەدەست بێباوەڕە ڕۆم و عەرەبە بەکرێگیراوەکان ڕزگار کرد و پاشەکشەی کرد پێیان، بۆ بەری بەیان (خالد) دەستکاری ڕێکخستنی سوپاکەی کرد، لای ڕاست و چەپ و پێش و دواوەی سوپاکەی گۆڕی، بەوە ڕۆمەکان

وایانزانی موسڵمانان سوپای هاوکارییان بۆ هاتووە، بۆیە لەسەر دەستی موسڵمانان شکستێکی سەختیان تووش بوو.

کاتێک سوپاکە بەرەو (مدینة) گەڕانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان چوون بۆ پێشوازییان، بەڵام موسڵمانان لە تاو خەفەتی ئەوەی کە بۆچی ئەو هەموو شەهیدمیان هەبووە و سەرنەکەوتون خۆڵیان فڕێ دەدا بەڕوویاندا و دەیانوت ئەی ڕاکردوان ڕاتانکرد و ڕێی خواتان بەردا؟! پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی دانەوە و فەرمووی: (ئەوانە ڕاکردوو نین، بەڵکو خوا بیەوێت هێرش دەبەنەوە).

فەتحی (مكة) یەکەم غەزا بوو کە تیایدا (خالد) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری غەزا بکات و پێشتر لە هیچ غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نەبوو، چونکە ئەوکات بێباوەڕ بوو.

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) (خالد)ی ڕاسپارد، تا چەند بتێک لە چەند ناوچەیەکی جیاواز لە ناوبەرێت، ئەویش ئەرکەکەی بەجێگەیاند.

لە سەردەمی خیلافەتی (أبوبكر الصديق)دا (خالد بن وليد) ئەرکی لێدانی هەڵگەڕاوەکانی پێ سپێردرا و زۆر سەرکەوتوانە توانی شکۆی ئیسلام بپارێزێت و هەڵگەڕاوەکان لەناوبەرێت، تا

لە ژیاندا مابوو سەرقاڵی جیهادی ڕێی خوا بوو، تا لە ساڵی بیست و یەکی کۆچی و لە تەمەنی شەست ساڵیدا وەفاتی کرد، لە پێش مردنی وەسییەتی کرد و وتی: ئەگەر مردم چەک و ئەسپەکەم دابنێن بۆ ڕێی خوا، هەروەها دەیوت لەم سەرزەویەدا هیچ شتێک نییە هێندەی ئەوە لام خۆشەویست بێت کە لە شەوێکی سارددا لە ناو دەستەیەکی سوپای کۆچەراندا بم کە بەرانبەر دوژمن لە چاوەڕوانی جەنگدان، دەی گرنگی بدەن بە جیهاد.

**پرسیار:**

١- (خالد) لە سەردەمی نەفامیدا چ ئەرکێکی هەبوو؟
٢- هۆکاری موسڵمانبوونی (خالد) چی بوو؟
٣- مەرجی موسڵمانبوونی (خالد) چی بوو؟
٤- بۆچی بە (خالد) دەوترێت شمشێری خوا؟
٥- ڕۆڵی (خالد) لە غەزای موئتەدا باس بکە.
٦- دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) (خالد) چی کرد؟

## ١٢- (بلال بن رباح)(رضي الله عنه)

لە خوارووی کیشوەری ئەفریقیاوە وڵاتێک هەبوو کە پێی دەوترا (حبشة)، وڵاتێک کە خەڵکەکەی ڕەش پێست و مەسیحی بوون، جارجارە هەندێک لەوانە بە کۆیلە دەگیران و دەبران لە وڵات و ناوچەکانی تردا بە کۆیلەیی دەفرۆشران، تا خزمەتی کڕیارەکانیان بکەن.

یەکێک لەوانە منداڵێک بوو بە ناوی (بلال بن رباح)، جا نازانرێت ئایا هەر لە (حبشة) لە دایک بووە، یان دایک و باوکی بە کۆیلەیی هاتوونەتە (مكة) و لەوێ لەدایکبووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کەسێکی حەبەشی بوو وە کرابوو بە کۆیلە.

(بلال بن رباح) کەسێکی لاوازی باڵابەرز بوو، قژی زۆر بوو، (بلال بن رباح) کۆیلەی (أمية بن خلف) بوو، (أمية)ش لەسەر موسڵمانبوونی سزای سەختی دەدا.

(بلال) هەر کە بانگەوازی ئیسلامی بیست خێرا موسڵمان بوو، یەکێک بوو لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبووانی (مكة)،

هەروەها یەکێک بوو لەو کەسانەش کە موسڵمانبوونەکەی خۆی ئاشکرا کرد و بێباوەڕان پێیان زانی موسڵمان بووە، بۆیە زۆر ئازاریان دەدا، بەرگی ئاسنینیان دەکردە بەر و دەبرایە بەر گەرمای خۆر، زۆر داوای لێدەکرا، تا واز لە ئیسلام بهێنێت و قسە بڵێت بە خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئەو ئامادەیی نەبوو داواکەیان قبووڵ بکات، ئەوانیش پەتێکیان دەخستە گەردەنی و دواتر پەتەکەیان دەدایە دەست مێردمنداڵان، تا ڕایکێشن بە دۆڵەکانی (مکة)دا، ئەویش بەردەوام دەیوت (أحد أحد) واتە: خوا تاک و تەنهایە.

**پەند و وانە:**

پێویستە لە پێناو ئایینی خوادا بەرگەی سەختی و ناڕەحەتیەکان بگرین و ناڕەزایی دەرنەبڕین، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر لەسەر ئیسلام ئازار دەدران و بەرگەیان دەگرت و پاشگەز نەدەبوونەوە لە دینی خوا، ئەگەر ئێمەش لە کار و پەرستش و ئاییندارییماندا ناڕەحەتیەکمان هاتە ڕێ، دەبێت نموونەی (بلال) و هاوەڵانی ترمان لەبەرچاو بێت کە چەندە بەرگەی ناڕەحەتییان گرتووە.

کاتێک (بلال) ئازار دەدرا بێباوەڕان پێیان دەوت: ئەوە بڵێ

کە ئێمە دەیڵێین، (بلال)یش دەیوت زمانم پێی ناوترێت -نایەتە سەرزمانم-.

جارێک (بلال بن رباح) لەلایەن قورەیشیەکانەوە ئازار دەدرا، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی دیبوو کاتێک گەیشت بە (أبوبکر) فەرمووی: (خۆزگە شتێکمان لا دەبوو -پارەیەکمان دەبوو- (بلال)مان پێ دەکڕی)، ئەوەبوو (أبوبکر) گەیشت بە (عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: (بلال)م بۆ بکڕە، (عباس)یش چوو بۆ لای گەورەکەی (بلال) و وتی: ئەتوانیت بیفرۆشیت بە من؟ ئەویش وتی جا چی پێ دەکەیت؟ ئەوە پیسە، (عباس) وتی: دەمەوێت. ئەوەبوو (بلال)ی کڕی و ناردی بۆ لای (أبوبکر)، ئەویش ئازادی کرد.

**پەند و وانە:**

پێویستە، ئەگەر توانیمان باری ناڕەحەتی کەسێک لابەرین، لێی نەوەستین و خێرا یارمەتی بدەین و ئەو ناڕەحەتیەی لەسەر لابەرین، چونکە هەرکەس ناڕەحەتی لەسەر کەسێ لابەرێت، ئەوە خوای گەورەش ناڕەحەتی لەسەر ئەو لادەبات و لە کاتی تەنگانەدا فریای دەکەوێت.

جارێک (أقرع) لەگەڵ (عیینة)دا بوو، سەیریان کرد

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (عمار) و (صهیب) و (بلال) و (خباب) و چەند موسڵمانێکی تری لاوازدا دانیشتووە، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و دەیانوت کە وەفدی عەرەب دێن شەرم دەکەین بمانبینن لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتبیت، ئەگەر هاتین بۆ لات تۆ ئەوانە دەرکە، پێغەمبەریش(ﷺ) خەریک بوو ڕازی بێت بەو هیوایەی ئەوانەش موسڵمان بن، ئەوانیش وتیان: دەی بەڵێنێکمان بۆ بنووسە، ئەویش ویستی بینووسێت و (علي بن أبو طالیب)ی بانگ کرد، تا بینووسێت، ئەوەبوو (جبریل) هات و ئایەتی خوای بۆ هێنا کەتیایدا خوای گەورە ڕێی نەدا پێغەمبەر(ﷺ) وا بکات و فێڵەکەی ئەوانی ئاشکرا کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) وەرەقەکەی فڕێ دا و ئەو هاوەڵانەی بانگ کردەوە و لەگەڵ ئەواندا دانیشت.

**پەند و وانە:**

گەورەیی و ڕێزداری بە دەوڵەمەندی و هەژاری نییە، زۆر جار کەسانێکی هەژار و نەدار هەن لای خوا زۆر گەورەتر و خۆشەویستترن لە کەسانێکی دەوڵەمەندی خۆبەزلزان، یان خوانەناس، دەبێت ئێمەش وریا بین لەبەر دڵی ئەو دەوڵەمەندانە دڵی هەژار و لاوازەکان نەڕەنجێنین، با، تەنانەت نییەتیشمان چاک بێت و لەپێناو ئەوەدا بێت هەوڵ بدەین ئەو دەوڵەمەند و

کەسە بەناوبانگانە موسڵمان بن، هەر نابێت مافی هەژار و لاوازە موسڵمانەکان بخۆین و وریا بین پشتگوێیان نەخەین.

کاتێک هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ (مدینة)و لەوێ مانەوە، (بلال)یش کۆچی کرد، لەوێ هەریەک لە (بلال) و (أبوبکر الصدیق)تووشی تایەکی سەخت بوون، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی بینی نزای کرد و فەرمووی: (خوایە، (مدینة)مان لا خۆشەویست بکە وەک خۆشەویستیمان بۆ (مکة)، یان زیاتر لەوەش، خوایە، بەرەکەت بخەرە ڕزق و ڕۆزیمانەوە و تەندروستی بکە بۆمان، تای (مدینة)ش بگوازەرەوە بۆ (جحفة) -ناوچەیەک بوو-).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان (بلال) و (أبوبریحة)وە.

(بلال بن رباح) یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر و لەو غەزایەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو، ویستی خواش وابوو لەو غەزایەدا (بلال) (أمیة بن خلف)ی کوشت.

لە غەزای بەدردا (أمیة بن خلف) و (علي) کوڕیشی بەشدار بوون، کاتێک (بلال) (أمیة)ی بینی وتی ڕزگارم نەبێت، ئەگەر بهێڵم تۆ ڕزگار بیت، ئینجا، تا توانی هاواری کرد ئەی پشتیوانانی خوا وا سەری کوفر (أمیة بن خلف)ە ڕزگارم نەبێت،

ئەگەر بهێڵم ڕزگاری بێت، هاوەڵان دەوریان دان، کەسێک دای لە (علي بن أمية) و کوشتی، ئینجا دایان لە (أمية)ش و ئەویشیان کوشت.

(بلال) لە غەزاکانی ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.

(بلال) لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) مزگێنی چوونە بەهەشتی پێ دراوە، وەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) جارێک لە کاتی نوێژی بەیانیدا بە (بلال بن رباح)ی فەرموو (ئەی (بلال) پێم بڵێ چ کارێکت لە ئیسلامدا کردووتە زۆر دڵی خۆش کردویت و هیوات پێیەتی، چونکە من لە بەهەشتدا گوێم لە تەپەی نەعلەکانت بوو لە پێش خۆمەوە)، (بلال) وتی دەستنوێژم گرتبێت شەو بێت، یان رۆژ، تا توانیومە بەو دەستنوێژە نوێژم کردووە، یان دەیوت هەرکات بانگم داوە دوو رکات نوێژم کردووە، هەرکات دەستنوێژم شکابێت خێرا دەستنوێژم گرتوەتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتا بۆ کۆکردنەوەی خەڵک بۆ نوێژ چاوەڕێی خەڵکی دەکرد لە کاتی نوێژەکاندا بێن بۆ نوێژ بێ ئەوەی بانگ بکرێن، بۆیە ویستی وەک بووقەکەی جوولەکە بووقێک دابنێت، تا موسڵمانان بانگ بکرێن بۆ نوێژ، بەڵام

دڵی نەیگرت و پێی خۆش نەبوو، دواتر فەرمانی کرد بە زەنگ موسڵمانان بانگ بکرێن بۆ نوێژ، لەو کاتەدا (عبدالله بن زید) لە خەودا بانگی پێ وترا، (عبدالله) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمشەو لەخەومدا کەسێک هات دوو جلی سەوزی لەبەربوو و زەنگێکی بەدەستەوە بوو، وتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشیت؟ وتی بۆ چیتە؟ وتم: تا خەڵکی پێ بانگ بکەین بۆ نوێژ، ئەویش وتی ئایا لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟ وتم: چیە؟ وتی بڵێ:

الله أكبر الله أكبر

الله أكبر الله أكبر

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن محمدا رسول الله

أشهد أن محمدا رسول الله

حي على الصلاة

حي على الصلاة

حي على الفلاح

حي على الفلاح

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

دواتر کەمێک وەستا، پاشان هەمان شتی وت، بەڵام بە تاک هەمووی وت، بەڵام لە کۆتاییدا وتی:

قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

کاتێک ئەو خەوەی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پشت بە خوا ئەو خەوە ڕاستە، دەی هەستە بیڵێ بە (بلال)، چونکە ئەو دەنگی لەتۆ بەرزتر و باشترە، کاتێک (بلال) هەستا ئەو بانگەی دەدا (عمر بن الخطاب) لەماڵەوە بوو ئەوەی بیست، خێرا هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و عەباکەی ڕادەکێشا و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە من هەمان ئەم خەوەم بینی کە -(عبدالله)- بینیویەتی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (سوپاس بۆ خوا، دەی ئەوە دڵنیایی زیاتر دەبەخشێت).

جارێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی (بلال)ی کرد، (بلال) بڕێک خورمای هێنا کەهەڵیگرتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوە چیە ئەی (بلال)؟ وتی خورمایە ئەی پێغەمبەری

خوا(ﷺ) هەڵمگرتووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا ناترسیت لەبەر ئەوە دەنگی بوخار لە دۆزەخ ببیستیت، ئەی (بلال) ببەخشە و مەترسە خاوەنی عەرش –خوای گەورە- کەمی بکاتەوە).

**پەند و وانە:**

دەبێت لەوە دڵنیا بین هیچکات بە بەخشین سامان و پارەمان کەم ناکات، بەڵکو هەرکات ببەخشین خوای گەورە چەند بەرانبەر زیاترمان پێ دەبەخشێت، یان زۆر جار بە هۆی بەخشینەوە خوای گەورە سەختی و بەڵا و نەخۆشیمان لێ دوور دەخاتەوە.

لە فەتحی (مکة)دا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە (بلال بن رباح)، تا بچێتە سەر کەعبە و بانگ بفەرموێت، ئەویش سەرکەوتە سەر کەعبە و بانگی فەرموو.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی خرایە ناو گۆڕەوە و داپۆشرا، ئینجا (بلال) بڕێک ئاوی هێنا و دەیپرژاند بەسەر گۆڕەکەیدا، لە لای ڕاستەوە لە سەریەوە دەستی پێکرد، تا لای قاچەکانی ئاوپرژێن کرد.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئیتر (بلال) توانای نەما بانگ بدات، شارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەنگی

بانگی بانگبێژەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) تێدا نەما.

(عمر بن الخطاب)دەیوت (أبوبکر) گەورەمانە و گەورەی ئێمەشی ئازاد کرد-واتە (بلال)-.

(بلال) پاش سەفەرەکەی (مدینة)ی گەڕایەوە شام و لەوێ مایەوە، تا لە ساڵی بیستی کۆچیدا وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

١- (بلال) چۆن کرا بە کۆیلە؟

٢- کێ (بلال)ی ئازاد کرد؟

٣- بێباوەڕان چۆن ئازاری (بلال)یان دەدا؟

٤- (بلال) چۆن فێری بانگدان بوو؟

٥- بۆچی،(بلال) شاری (مدینة)ی جێهێشت؟

٦- کاریگەرترین بەسەرهاتی ناو ژیانی (بلال) لای تۆ چی بوو؟

## ١٣- (أرقم بن أبي أرقم)(رضي الله عنه):

لە شاری (مكة) و لە ناوچەی (صفا) لە کەنارێکەوەماڵێک هەبوو کە دواتر بوو بە بنکەی بانگەوازی ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان تیایدا کۆدەبوونەوە، ئەو ماڵەش هی کەسێک بوو بە ناوی (أرقم بن عبدمناف)، دایکی ناوی (أوميمة) بوو.

(أرقم) هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە موسڵمان بوو، (أرقم) هێندە زوو موسڵمان بوو کە هێشتا ژمارەی موسڵمانان لە دە کەس کەمتر.

پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان لە ماڵەکەی (أرقم)دا کۆدەبوونەوە و لەوێ هاوەڵان ڕێنماییان لە پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگرت، هەر لەو ماڵەدا بوو کە (عمر بن الخطاب) موسڵمان بوو، ئیتر کە (عمر) موسڵمان بوو موسڵمانان لە ماڵی (أرقم)ەوە چوونە دەرەوە و موسڵمانبوونی خۆیان ئاشکرا کرد.

(أرقم) تەمەنێکی زۆری نەبوو و هێشتا زۆر گەنج بوو کە موسڵمان بوو، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە شارەزایی و

هەڵکەوتەیی بە تەمەن نییە و زۆر جار دەکرێت کەسێک کە تەمەنی کەمە زۆر شارەزاتر و زاناتر بێت لە کەسانێکی بە تەمەن.

کاتێک هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ (مدینة)، (أرقم)یش کۆچی کردوو لەوێ سەرقاڵی پەرستش بوو، ڕۆژێک هاوەڵان کۆبوونەوە، تا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بچن بۆ غەزای بەدر، (أرقم)یش خۆی ئامادە کرد و هاوەدەم بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتەڕێ و لە غەزاکەدا بەشداری کرد، دواتریش بەشداری غەزاکانی تری کرد و لە جەنگی ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو، ئەمەش نیشانی ئەدات (أرقم) چەندە ئیسلامی خۆشویستووە و ئامادە بووە گیانی خۆی لە پێناودا بەخت بکات.

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێکجار ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی دەسپارد بە (أرقم)، (أرقم)یش کەسانی دڵسۆزی لەگەڵ خۆی دەبرد، تا هاوکاری بکەن و بە جوانی ئەرکەکە بەجێ بگەیەنن.

جارێکیان (أرقم) خۆی ئامادە کرد، تا بچێت بۆ مزگەوتی ئەقصا، هات تا ماڵئاوایی بکات لە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوایش پێی فەرموو: بۆ بازرگانی دەچیت، یان بۆ سەردان؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم، بەڵکو ئەمەوێ بچم نوێژی تێدا بکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نوێژێک لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لە هەزار

نوێژ لە مزگەوتانی تردا جگە لە (مسجد الحرام)، (أرقم) کە ئەوەی بیست دانیشت و نەچوو بۆ گەشتەکەی.

**پەند و وانە:**

ئەمە وانەیەکە، تا ئەوەی لێوە فێر بین بیرکردنەوە و قەناعەتمان بەو جۆرە بێت کە خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەیفەرموون، نەوەک بە ئارەزوو و بیرکردنەوەی خۆمان بڕیار لەسەر شتەکان بدەین، چونکە ئاییندارى دەبێت بەو جۆرە بێت خوا دەیەوێت، ئەگینا خێرا ئایینەکەمان دەشێوێت و وەک ئایینەکانی پێشوو ڕاستیەکانی دینەکەمان لەدەست دەدەین.

هەروەها (أرقم) یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی نامەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەنووسی، هەندێکجار پێغەمبەر(ﷺ) کە نامەی دەنووسی بۆ کەسێک، یان هۆزێک، دەینارد بە شوێن (أرقم)دا تا بێت، (أرقم) دەهات و پێغەمبەر(ﷺ) چی دەفەرموو بە جوانی بۆی دەنووسیەوە.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نامەکانی نەدەنووسی؟

وەڵام: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) خوێندەواری نەبوو و نووسین و خوێندنەوەی نەدەزانی.

(أرقم) ماوەیەکی زۆر ژیا، تەمەنی زیاتر لە هەشتا ساڵ دەبوو، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا، ڕۆژێک وەسیەتی کرد، ئەگەر مرد یەکێک لە کەسە خۆشەویستەکانی نوێژی

لەسەر بکات، ئەو کەسەش بریتی بوو لە (سعد بن أبي وقاص)، ئەوەبوو کە (أرقم) وەفاتی کردو (سعد) لە شوێنێکی زۆر دوور بوو، خێرا گەڕایەوە و نوێژی لەسەر کرد و وەسیەت و ئاواتەکەی (أرقم)ی بەدیهێنا.

**پەند و وانە:**

دەبێت هەوڵ بدەین برایەتی و هاوڕێیەتیمان لەگەڵ کەس و کار و دەوروبەرمان زۆر چاک بێت و ببینە مایەی دڵخۆشی و متمانەی کەسەکانمان. هاوڕێیەتی بە خۆشەویستی و متمانەی نێوان هەردوولا زۆر بەهێز دەبێت، جا ئەگەر نەتوانین هیچ چاکەیەکمان هەبێت بۆ هاوڕێ و کەسەکانمان، دەتوانین بە زەردەخەنە و قسەیەکی خۆش دڵخۆشیان بکەین، چەندە بتوانین ئاوات و ئارەزووە چاکەکانیان بەدی بهێنین.

**پرسیار:**

١- گرنگیماڵی (أرقم) لە چیدا بوو؟
٢- بۆچی (أرقم) چوو بۆ (مدینة)؟
٣- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نامەکانی نەدەنووسی؟
٤- (أرقم) پێش مردنی چی وت؟
٥- چ سوودێکت وەرگرت لە ژیانی (أرقم)؟

## ١٤- (جابان الكردي) (رضي الله عنه)

پێغەمبەری ئیسلام (محمد)(ﷺ) لەلایەن پەروەردگارەوە کرا بە پێغەمبەر بۆ هەموو مرۆڤایەتی، تا ببێتە ڕەحمەت و خێر و بەرەکەت بۆ هەموو دنیا نەوەک تایبەت بێت بە عەرەبەکانەوە، جا ویستی خوا وابوو جگە لە عەرەبەکان هەندێ نەتەوەی تر هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بچنە (مدينة)و بگەن بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، لەناو کوردانیشدا هاوەڵێکی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو بە ناوی (جابان) کە چەند جارێک چوو بووە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودەی لێوە دەبیست و دواتر دەیگێڕایەوە بۆ منداڵەکانی.

(جابان) کە موسڵمان بوو، خێرا ئایینەکەی گەیاندە خێزانەکەی و منداڵەکانی موسڵمان بوون، ئیتر کوڕەکەی گوێی لە باوکی دەگرت و فەرموودەی لێوە دەبیست، هەرچەندە کوڕەکەی وەک باوکی نەیتوانی بچێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئەویش چوو بۆ شارەکەی پێغەمبەر(ﷺ)

و لەوێ هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەبینین و دەچوویە خزمەتیان و فەرموودەی لەوانەوە دەبیست و دواتر دەیگێڕایەوە بۆ موسڵمانان.

(جابان) فەرموودەیەک لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: زیاد لە جارێک و دوو جار بگرە دەگەیشتە دە جار لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: (هەرکەس ئافرەتێک مارە بکات و نیازی ئەوەی هەبێت مارەییەکەی پێ نەدات ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا وەک زیناکار دەگاتەوە بە خوا).

ئەمە نیشانەی ئەوەیە (جابان) زۆر چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) چونکە ئەوەتا دەڵێت: دە جار ئەوەم لێ بیستووە، دەی خۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە یەک کاتدا لە سێ جار زیاتر شتی دووبارە نەکردوەتەوە، واتە دەبێت چەند جارێک (جابان) چووبێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ئەوەندە جار ئەو فەرموودەی بیستبێت.

هەروەها ئەمە ئاماژەیە بە دڵسۆزی (جابان) لە گەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)، تا موسڵمانانی تر سوودی لێ وەربگرن.

هەروەها (جابان) فەرموودەیەکی تری لە پێغەمبەری

خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

کوڕەکەی (جابان) دەڵێت: باوکم زۆر فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆ نەدەگێڕاینەوە لە ترسی ئەوەی نەوەک هەڵەی تێدا بکات. باوکم دەیوت بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (هەرکەس بە ئەنقەست درۆیەکم بە دەمەوە بکات، دەبێت شوێنی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات).

هەروەها پێویستە ئەوەش بزانین کەپێغەمبەر(ﷺ) کوردی ناسیوە و، تەنانەت جلوبەرگی کوردیشی کردووەتەبەر، ئەوەتا دایکی باوەڕداران (عائشة) کە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) جلێکی لەبەردا بوو، ویستی بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، بەڵام داوای کرد بچن جلێکی کوردی بۆ بهێنن کە هی کەسێک بوو بە ناوی (أبي جهم) و جلەکەی خۆی نارد بۆ ئەو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە جلە کوردیەکەوە بەرنوێژی کرد بۆ هاوەڵان.

**پرسیار:**

١- ئایا کورد چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)؟

٢- ئەو فەرموودانەی (جابان) گێڕاویەتیەوە چەند فەرموودەن؟

٣- هەردوو فەرموودەکەی (جابان) بۆ کەسێکی لە خۆت گەورەتر باس بکە؟

٤- بەسەرهاتی جلە کوردیەکەی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟

# ١٥- (زید بن سهل) (أبو طلحة الأنصاري)(رضي الله عنه)

دووبـاره شـاره خۆشەویسـتەکەی پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) هـاوەڵێکی گەورەمـان پـێ دەناسـێنێت کە نمـوونەی دڵسـۆزی و لەخواترسان بـووە، یەکێـک لە پشـتیوانان، ئەو پشـتیوانانەی کە دەرگایـان والآ کـرد بـۆ پێغەمـبەر (ﷺ) و هـاوەڵانی و بانگەوازەکەی و بوونە هۆکاری سەرخستنی ئیسلام، ئەم هاوەڵە ئازیزەش ناوی (زید بن سهل)ە کە زیاتر بە (أبو طلحة) ناسراوە.

پرسیار: (زید) چۆن موسڵمان بوو؟

وەڵام: (زیـد) ئـافرەتێکی بە دڵ بـوو کە ناسـرابوو بە (أم سـليم). زۆر حەزی دەکـرد هاوسـەرگیری لەگەڵ بکـات، بەڵام (زید) بێباوەڕ بوو و (أم سليم)یش موسڵمان بوو، دواجار بڕیاریدا بچێتە داوای کە خوازبێنی کرد (أم سليم) وتی: کەسی وەک تۆ هی ئەوە نییە جواب بکرێت، بەڵام من ئافرەتێکی موسڵمانم و تۆیش کەسێکی بێباوەڕیت و بۆ من حەڵاڵ نییە شوو بکەم بە

تۆ، ئەگەر موسڵمان بیت ئەوە مارەییشم ناوێت و داوای هیچ مارەییەکی ترت لێناکەم، (أبوطلحة)ش موسڵمان بوو، ئینجا (زید) چوو بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) و بینی چواردەوری قەرەباڵغە، پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أبوطلحة) دێت بۆ لاتان و تارمایی ئیسلام بە نێوچاوانییەوەیەتی). (زید) هات و وتەکانی (أم سلیم)ی بۆ باسکرد و لەسەر ئەوە (أم سلیم)ی مارە کرد.

دوای ماوەیەک (أم سلیم) سکی بوو و منداڵێکی بوو. (زید) زۆر ئەو منداڵەی خۆشدەویست، بەڵام منداڵەکە نەخۆش کەوت. (زید) زۆر زۆر خەفەتی بۆ دەخوارد، بەیانی و ئێوارە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، جارێک دوای ئێوارە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کەچی منداڵەکە وەفاتی کردبوو، (أم سلیم) منداڵەکەی بۆنخۆش کرد و جوان شۆردی کە (زید) هاتەوە وتی: کوڕەکەم چۆنە؟

ئەویش وتی: باشە، و لەو کاتەوەی نەخۆش بووە هیچ شەوێک هێندەی ئەمشە و هێور و ئارام نەبووە. (زید)یش سوپاسی خوای کرد و بەوە زۆر دڵخۆش بوو، نانی خوارد و (أم سلیم)یش بۆنی خۆشی دا لە خۆی و دەچوو بە دەوری (زید)داو تا ئەوەی (زید) لەگەڵی سەرجێی کرد. دوای هەموو ئەوانە، ئینجا (أم سلیم)

پێی وت: ئەگەر دراوسێکەت شتێکت پێبدات و تۆیش سوودی لێ ببینیت و دواتر بیەوێت لێت وەربگرێتەوە تۆ چی دەکەیت؟

(زید) وتی: وەڵا بۆی دەگێڕمەوە.

(أم سليم) وتی: لە ناخی دڵتەوە بۆی دەگێڕیتەوە؟

وتی: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە.

(أم سليم) وتی: دەی خوای گەورە کوڕێکی پێدایت و تۆیش بەشی خۆت خۆشیت لێ بینی، دواتر منداڵەکەت کۆچی دوایی کرد، بۆیە خۆڕاگر بە و لای خوا چاوەڕێی پاداشت بە.

(زید)یش بێتاقەت بوو، بەڵام خۆڕاگری نواند، بۆ بەیانی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بە وردی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (خوا بەرەکەت بخاتە ئەمشەوتانەوە). ئەوەبوو (أم سليم) سکپڕ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە (زید)ی فەرموو، ئەگەر (أم سليم) منداڵەکەی بوو بیهێنە بۆم کە منداڵەکەی بوو منداڵەکەی بە پارچە قوماشێک پێچایەوە و بردی بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) خورمایەکی هێنا بە لێوەکانیدا و خستیە دەمیەوە و منداڵەکەش دەیمژی، پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا (عبدالله) و نزای خێری بۆ کرد.

**پەند و وانە:**

پێویستە لە هەموو کاتێکدا سوپاسگوزار بین و دڵنیا بین هەموو شتێک بە دەستی خوایە، و هەرچییەک ڕوویدات خێری تێدایە بۆمان، لەوانەیە هەندێکجار نەزانین خێرەکە چییە، بەڵام خوای گەورە زاناترە، هەروەها کاتێک خوای گەورە تاقیمان دەکاتەوە دەبێت سوپاسی خوای لەسەر بکەین و کارێک نەکەین خوا لە خۆمان بڕەنجێنین.

(زید) یەکێکە لەو هاوەڵانەی هەر لە غەزای بەدرەوە تا دوا غەزا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەشداری کرد، لە جەنگی ئوحوددا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تیری دەهاویشت، پێغەمبەریش (ﷺ) لە دوایەوە بوو و قەڵغانی بۆ گرتبوو، کاتێک تیرێکی دەهاویشت پێغەمبەر (ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە و تەماشای دەکرد بزانێت تیرەکە کوێی گرتووە، (زید)یش سەرسنگی خۆی بەرز دەکردەوە و دەیوت ئا بەو جۆرە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم، وریابە تیرت بەرنەکەوێت، سنگم دەکەمە قەڵغان بۆت، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) من زۆر جیسرٍ و بەهێزم، چی ئیشێکت هەبوو فەرمانم پێ بکە.

(زید) هاودەم بە خۆی (أم سليم)یشی بردبوو بۆ غەزای ئوحوود، لەو کاتەدا کە موسڵمانان بریندارێان زۆربوو،

(عائشة)ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) و (أم سليم)ی خێزانی (زيد) دەچوون بە کونە و گۆزە ئاویان دەبرد بۆ موسڵمانان.

پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی دەفەرموو: (دەنگی (أبو طلحة) لە سوپادا باشترە لە هەزار پیاو).

(أنس بن مالك) دەڵێت: من لە ماڵی (زيد) بووم کە لە وێ مەیم دەگێڕا بۆ خەڵکی، هێشتا مەی حەرام نەکرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کەسێک هاواری دەکرد وریابن وا مەی حەرام کرا، خێرا (زيد) هەستا و وتی: بڕۆ ئەو مەیە بڕێژە، منیش چووم و ڕێشتم.

(أنس) دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە (مدينة) خزمەتکاری نەبوو، (زيد) دەستی منی گرت و منی بردە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) (أنس) منداڵێکی ژیر و وریایە، با خزمەتت بکات، ئیتر منیش هەمیشە لە خزمەتیدا دەبووم.

(أنس) دەڵێت جارێک (زيد) هاتەوە ماڵەوە و بە (أم سليم)ی وت دەنگی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەنگی کز بوو، وا هەست دەکەم برسی بێت، هیچمان نییە لە ماڵەوە؟

(أم سليم) وتی:بەڵێ.

ئەوەبوو بڕێک گەنمی دەرکرد و نانی پێ دروست کرد و بە

لەچکەکەی نانەکەی پێچایەوە و خستیە ژێر باڵم و ناردمی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ). (أنس) دەڵێت: چووم دەبینم پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتە و خەڵکی لەگەڵە، چووم بۆ لایان پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: ئەرێ (أبو طلحة) تۆی نارد؟

وتم: بەڵێ.

فەرمووی: خواردنی پێدا ناردویت؟

وتم: بەڵێ.

پێغەمبەر(ﷺ) بەوانەی دەوری فەرموو: هەستن. خەڵکەکە چوون و منیش چوومەوە بۆ لای (زید) و هەواڵم پێدا، ئەویش وتی: ئەی (أم سليم) وا پێغەمبەر(ﷺ) دێت و ئەو خەڵکەش لەگەڵ خۆی دەهێنێت و ئێمەش هیچمان نییە دەرخواردیان بدەین. (أم سليم) وتی خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، (زید) چوو تاوەکو گەیشتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) هاودەم بە (زید) هاتەوە و فەرمووی: ئادەی (أم سليم) چیت لایە بیهێنە، ئەویش نانەکەی بۆ برد، ئینجا (أم سليم) لە قاپێکدا خواردنێکی هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) برێ فەرمایشتی فەرموو و دواتر فەرمووی: دە کەس مۆڵەت بدە بێنە ژوورەوە، دە کەس هاتنە ژوورەوە و تێریان خوارد و چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی مۆڵەتی دە کەسی تر بدە بێنە ژوورەوە، ئەوانیش هاتنە ژوورەوە و

تێریان خوارد و چوونە دەرەوە، بەوجۆرە هەموویان تێریان خوارد کە هەموویان حەفتا، یان هەشتا کەس دەبوون.

**پەند و وانە:**

لەم بەسەرهاتەوە فێری ئەوە دەبین، تا دەتوانین ببەخشین، هەروەها زۆر چاومان لە سەرکردە و زاناکانمان بێت و بە هەر شێوەیەک بۆمان دەگونجێت هاوکاریان بین.

(زید) زۆر لە نزیک پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بوو و خۆی دوور نەدەگرت، (أنس) دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) سەری دەتاشی یەکەم کەس مووەکانی هەڵدەگرت (أبو طلحة) بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) زیاتری مووەکانی بەو دەبەخشی، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجدا مووەکانی سەری تاشی، مووەکانی لای راستی سەری دابەش کرد بەسەر ئەوانەی دەوروبەریدا، بەڵام هەموو مووەکانی لای چەپی بەخشی بە (زید).

(زید) لە (مدینة) باخێکی دارخورمای هەبوو کە بەرانبەر بە مزگەوت بوو، لە هەمووان زیاتر باخە خورمای هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ ناو ئەو باخەی و لەوێ لەو کانیاو و بیرەی تیایدا بوو ئاوی دەخواردەوە، جارێک (زید) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاندووە و منیش ئەو باخەم کە ناسراوە بە

بەیروحا لە هەموو سامانێکم لام خۆشەویستترە، وا دەیکەمە خێر لە ڕێی خوادا و هیوام وایە، لای خوا پاداشتەکەی وەربگرمەوە، دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆنت پێ باشە ئاوای لێ بکە. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بەخ، ئەوە سامانێکی بە قازانجە، من بیستم چیت وت و پێم باشە دابەشی بکەیت بەسەر خزم و نزیکاندا.

(زید) وتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ئەوە بوو دابەشی کرد بەسەر خزم و نزیکانیدا.

جارێک کابرایەک هات تا لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) بمێنێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵەوە هیچی نەبوو، بۆیە بە هاوەڵانی فەرموو ڕەحمەت لەو کەسەی میوانداری ئەم کەسە دەکات. (أبو طلحة) هەستا وە وتی: من. کابرای بردەوە ماڵەوە بە ژنەکەی وت: ڕێزی میوانی پێغەمبەر(ﷺ) بگرە. ژنەکەی وتی: تەنها خواردنی منداڵەکانمان هەیە. (زید) وتی: دەی خواردنەکە ئامادە بکە و چراکە بکوژێنەرەوە و منداڵەکان بخەوێنە، ئەویش نانەکەی ئامادەکرد و منداڵەکانی خەواند و چوو دەستکاری چراکەی کرد بەو بیانووەی چاکی دەکات و کوژاندیەوە، بەو جۆرە وایان لە میوانەکە تێگەیاند کە ئەوانیش نان دەخۆن، بۆ بەیانی کە چوویەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (**ضحك الله الليلة –أو عجب– من فعالكما**)، (خوا ئەمشەو پێکەنی –یان خوا ئەمشەو سەرسام بوو- لە کردەوەی ئەو دوانەتان).

**پەند و وانە:**

ڕێزگرتنی میوان یەکێکە لە سیفەتەکانی موسڵمان و هەرکەس باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت دەبێت ڕێزی میوانەکەی بگرێت، بەرانبەر بەوەش خوای گەورە پاداشتی بۆ دەنووسێت.

(زید) دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و نزیکەی بیست و ئەوەندە ساڵی بردەسەر، ئەو ماوەیەشی بە جیهادی سەنگەرەکان و شەونوێژی شەوان و ڕۆژووگرتنی ڕۆژان بەسەربرد، دواجاریش لەڕێی جیهاد و لە نێوەندی ئاو و دەریاکاندا وەفاتی کرد.

لە سەردەمی (عثمان بن عفان)دا کە ئیتر (زید) تەمەنی زۆر بوو، منداڵەکانی پێیان دەوت باوکە تۆ لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبکر) و (عمر)یشدا جیهادت کردووە، دەی ئیتر ئێستا دابنیشە، ئێمە لە بری تۆ جیهاد دەکەین، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و چوو بۆ جیهاد، تا لە دەریادا و لە ڕێی جیهاددا وەفاتی کرد. تا حەوت شەو و ڕۆژ دوورگەیەکیشیان دەست

نه‌كه‌وت تا ته‌رمه‌كه‌ی ئه‌سپه‌رده بكه‌ن، كه‌چی ته‌رمه‌كه‌ی تێكنه‌چوو.

**پرسیار:**

١- (زید) چۆن موسڵمان بوو؟
٢- باسی ڕۆڵی (زید) بكه له غه‌زای ئوحوددا.
٣- (أبو طلحة) چی كرد به باخه‌كه‌ی؟
٤- بۆچی خوا پێكه‌نی بۆ (زید) و هاوسه‌ره‌كه‌ی؟
٥- به‌سه‌رهاتی (زید) و منداڵه‌كانی چۆن بوو؟

## ١٦- (حـنظلة بن أبي عامر) (رضي الله عنه)

پشتیوانان هاوەڵانی دڵسۆز و خواناسی دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بوون، ئەوان شەو و ڕۆژ خزمەتی پێغەمبەری خوایان دەکرد و هەوڵیان دەدا پەیامی خوا سەربخەن، یەکێک لەو هاوەڵە خۆشەویستانەش بریتی بوو لە (حنظلة)، (حنظلة بن أبي عامر)بوو و ناسراوە بە غەسیلولمەلائیکە، چونکە کاتێک شەهید بوو فریشتەکان ئەویان شۆرد.

باوکی (حنظلة) لەسەردەمی نەفامیشدا باسی ئەوەی دەکرد دەبێت زیندووبوونەوە هەبێت و باسی ئایینی یەکخواپەرستی دەکرد، بەوە ناسرابوو کە خواپەرستی زۆری دەکرد، بەڵام کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەرکەوت، کەوتە حەسوودی و لە (مدینة) دەرچوو و چوویە ناو ڕیزی قورەیش و لە جەنگی ئوحوددا دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) جەنگا و دواتریش گەڕایەوە بۆ (مكة)و دواتر لەوێوە چوو بۆ وڵاتی ڕۆم و لەوێ مایەوە، تا لە ساڵی نۆی کۆچیدا بە بێباوەڕی مرد.

بەڵام (حنظلة) ڕێڕەوی باوکی نەگرتەبەر و لای

پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە و باوەڕی پێهێنا، تا ئەو ساتەی شەهید بوو ڕێڕەوی خواناسی بەرنەدا.

(حنظلة) داوای ئافرەتێکی کرد کە ناوی (جمیلة) بوو، (جمیلة) کچی سەرۆکی دووڕووەکانی ناو (مدینة) بوو، بەڵام (جمیلة)ش چەشنی (حنظلة) پێچەوانەی باوکی بوو و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئیتر کوڕ و کچێکی پاک و خواناس کە خاوەنی دوو باوکی خراپ و خوانەناس بوون، پێکەوە هاوسەرگیرییان کرد.

**پەند و وانە:**

کاتێک حەق و ڕاستی لە شوێنێک بوو دەبێت بێ دوودڵی شوێنی بکەوین و نابێت لەپێناو کەسێک، یان خزمێک، یان سەرکردەیەک دەستبەرداری ئەو ڕاستیە بین، با تەنانەت ئەو کەسەش باوک، یان دایکمان بێت، چونکە ئەگەر هەر کەسێک لە پێناو خزمایەتی، یان حیزبایەتیدا دەستبەرداری حەق و ڕاستی بێت، ئیتر ڕاستی لە کۆمەڵگەدا نامێنێت و ستەم و ناڕەوایی بڵاو دەبێتەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان (شماس) و (حنظلة)وە، ئیتر

ئەو دوانە وێنەی دوو برای خۆشەویست ژیانیان دەبردەسەر و پشتیوان و هاریکاری یەکتر بوون.

پێش ئەوەی جەنگی ئوحود ڕوویدات (حنظلة) و (عبدالله)ی ژنبرای هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)داوایان لێکرد مۆڵەتیان بدات، تا باوکی خۆیان بکوژن، چونکە باوکی هەردووکیان دوژمنی ئیسلام بوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا بە هیچکامیان.

(حنظلة) شەوێک پێش غەزای ئوحود ژنی گواستەوە، پێشتر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، تا شەو لای ژنەکەی بێت، چونکە دەیگوازێتەوە. پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدا، بەیانی زوو کە گوێی لە بانگەوازی جیهاد بوو چوو خۆی گەیاند بە سوپاکەی پێغەمبەر(ﷺ)، باوکیشی لە سوپای بێباوەڕاندا بوو، (جمیلة)ی ژنی (حنظلة) وتی خەوم دیوە ئاسمان کراوەتەوە بۆ (حنظلة) و ئەویش چووەتە ئاسمان بۆیە دڵنیام شەهید دەبێت.

(حنظلة) کە گەیشتە ئوحود بینی پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵە ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێک دەکات، کاتێک جەنگ ڕوویدا و موسڵمانان لە ئوحوددا شکان و دواتر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو (حنظلة)ش شەهیدبوو. پێغەمبەر(ﷺ)

بە هاوەڵەکانی فەرموو: فریشتەکان (حنظلة)ی هاوڕێتان دەشۆن.

پرسیار: تەرمی (حنظلة) چی لێهات؟

وەڵام: بێباوەڕەکانی قورەیش تەرمی شەهیدانی ئوحودیان دەشێواندن، تەنها تەرمی (حنظلة)یان نەشێواند، چونکە باوکی لەناو سوپای قورەیشیەکاندا بوو و بێباوەڕەکانیش بۆ دڵڕاگرتنی باوکی دەستکاری تەرمەکەی ئەویان نەکرد.

**پرسیار:**

١- بۆچی (حنظلة) و (عبدالله) داوایان کرد، تا باوکی خۆیان بکوژن؟

٢- ئایا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا باوکی خۆیان بکوژن؟

٣- (حنظلة) و (جمیلة)ی هاوسەری لە چی شتێکدا لەیەک دەچوون؟

٤- بۆچی تەرمی (حنظلة) نەشێوێنرا؟

٥- گرنگترین پەند و وانە لەم بەسەرهاتەدا باس بکە.

## ١٧- (جعفر بن أبو طاليب) (رضي الله عنه)

ژیان و بەسەرهاتی ئەمجارەمان تایبەتە بە یەکێک لە خزم و کەسە خۆشەویستەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئامۆزایەکی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا کە ناوی (جعفر بن أبو طاليب)ە، دایکی ناوی (فاطمة بنت أسد) بوو کە یەکێک بوو لە ئافرەتە خواناس و دڵسۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها (علي بن أبو طاليب) کە یەکێکە لە موژدە پێدراوانی بەهەشت و خەلیفەی چوارەمی موسڵمانان، برای (جعفر) بوو.

(جعفر) کە زانی (محمد)ی ئامۆزای بووەتە پێغەمبەری خوا، چوویە خزمەتی و باوەڕی پێ هێنا، بەڵام (أبو طاليب)ی باوکی هەر بە بێباوەڕی مایەوە، هەرچەندە (أبو طاليب) زۆر دڵسۆزانە پشتگیری پێغەمبەری خوای دەکرد و نەیدەهێشت بێباوەڕان زیانی پێ بگەیەنن، دایکی (جعفر)یش هاوشێوەی (جعفر) و (علي) باوەڕی هێنا.

ژنەکەی (جعفر)یش کە ناوی (أسماء بنت عميس) بوو

موسڵمانبوو، ئینجا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە موسڵمانانی (مکة) تا کۆچ بکەن بۆ (حبشة)، (جعفر) و ژن و منداڵەکانی کۆچیان کرد بۆ (حبشة) و ماوەیەکی زۆر لەوێ ژیان.

(جعفر) چاکترین کەس بوو، بەتایبەت لەگەڵ هەژاراندا زۆر چاک بوو، خزمەتی هەژارانی دەکرد و ئەوانیش خزمەتیان دەکرد، ئیتر وای لێهات پێغەمبەر(ﷺ) بە (باوکی هەژاران) ناوی دەبرد.

**پەند و وانە:**

چاکەکردن لەگەڵ هەژاران و هەست کردن بە ناڕەحەتیەکانیان ئەرکی سەرشانی موسڵمانە و پێویستە هەوڵ بدەین دەستگیرۆی هەژاران بین، تەنانەت ئەگەر توانامان نەبوو یارمەتی داراییان بدەین بە سەردان و زەردەخەنە و ڕووی خۆش ببینە هۆکاری دڵخۆشییان.

(جعفر) لە ڕووی شێوەی ڕوخسار و ڕەوشتیشەوە زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو. پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو: (تۆ لە شێوە و ڕوخسار و ڕەوشتدا لە من دەچیت).

پرسیار: (جعفر) لە (حبشة) چی دەكرد؟

وەڵام: (جعفر) لە (حبشة) سەرقاڵی بانگەوازكردن بوو بۆ ئاپینی خوا و لەسەر دەستی ئەو پاشای ئەو وڵاتە و ژمارەیەكی تر لە دانیشتوانی ئەوێ موسڵمان بوون، هەروەها بەربەرچی هەوڵی بێباوەڕانی دەدایەوە، كاتێك دەیانویست وا لە پادشای (حبشة) بكەن موسڵمانان لەوێ دەربكات.

كاتێك قوڕەیش (عمرو بن العاص) و (ولید)یان نارد بۆ (حبشة) تا پادشای ئەوێ ڕازی بكەن موسڵمانان دەربكەن، ئەو دوانە بڕێك دیارییان لەگەڵ خۆیان هێنابوو كە چوون بۆ لای (نجاشي)ی پادشای (حبشة) كڕنووشیان بۆ برد و دیاریەكانیان پێشكەش كرد و داوایان كرد موسڵمانان بدەنەوە دەست ئەوان، تا بیانبەنەوە بۆ (مكة) و نەهێڵن لە (حبشة)دا بە ئازادی بژین. (نجاشي) وتی: دەبێت گوێیان لێ بگرم بزانم چی دەڵێن، پاشان بڕیار دەدەم. بۆیە ناردی بە شوێن موسڵماناندا. (جعفر) بە هاوەڵەكانی وت: من لەبری هەمووتان قسە دەكەم، هەموو بە دوای (جعفر)دا چوونە ژوورەوە.

بە (جعفر)یان وت: بۆچی،كڕنووش نابەیت بۆ پاشا؟ وتی: ئێمە تەنها كڕنووش بۆ خوا دەبەین.

وتیان: بۆچی؟

وتی: چونكە خوا پێغەمبەرێكی لەنێوماندا نارد و فەرمانی

پێکردین تەنها کڕنووش بۆ خوا بەرین و نوێژ بکەین و زەکات بدەین:

(نجاشي) وتی: ئەم ئایینەی ئێوە چیە؟

(جعفر)یش وتی: ئەی پاشا ئێمە گەلێک بووین لەسەر بێباوەڕی بووین و بتمان دەپەرست و مردارەوەبوومان دەخوارد و گوێمان لە حەڵاڵ و حەرام نەبوو، ئەوەبوو خوا لە ناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە وەفادار و ڕاستگۆ و ئەمانەت پارێز بوو، بانگی کردین، تا خوای تاک و تەنها بپەرستین و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنین و دراوسێیەتیمان باش بێت و نوێژ بکەین و ڕۆژوو بگرین.

(عمرو) وتی: ئەوان سەبارەت بە (عیسی بن مریم) و دایکی پێچەوانەی ئێوە قسە دەکەن.

(نجاشي) وتی: سەبارەت بە کوڕی (مریم) و دایکی چی دەڵێن؟

(جعفر)یش بڕێک لە سوورەتی (مریم)ی لە سەرەتاوە بۆ خوێندنەوە، (نجاشي) هێندە گریا تا ڕیشی تەڕ بوو، ئەو پیاوە ئایینیانەی تری مەسیحیش کە لەوێ بوون تێر گریان، ئینجا (نجاشي) وتی: من شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوایە، و ئەوەیە کە لە ئینجیلدا هاتووە و (عیسی) مزگێنی لەبارەوە داوە. سوێند بەخوا، ئەگەر من لەم پاشایەتیەمدا نەبوومایە دەچووم بۆ لای و دەبوومە نەعل هەڵگر و ئاوی دەستنوێژیم دەدا

پێی، ئینجا بە موسڵمانانی وت: بڕۆن لەکوێ دەتانەوێت بمێننەوە، فەرمانیشی کرد دیاریەکان بدەنەوە بە (عمرو) و (ولید) و داواکەی ئەوانی بەرپەرچ دایەوە.

لە کاتی جەنگی خەیبەردا (جعفر) و هاوەڵانی تری لە (حبشة) بڕیاریان دا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و بچن بۆ (مدینة)، کاتێک چوونەوە موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەستهێنابوو، پێغەمبەر(ﷺ) نێوچاوانی (جعفر)ی ماچ کرد، ئینجا فەرمووی: نازانم بە کامیان دڵخۆش بم، بە هاتنی (جعفر)، یان بە سەرکەوتنی خەیبەر.

(جعفر) و موسڵمانان هاودەم بە خۆیان بڕێکی زۆر دیاری و خەڵاتی (نجاشي)یان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنابوو، هەروەها (نجاشي) برازایەکی خۆی ناردبوو، تا لە بری خۆیدا خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات.

دوای ماوەیەک پێغەمبەر(ﷺ) (جعفر)ی ئامۆزای کرد بە بەرپرسی سوپایەک، تا بچن بۆ شام و دژ بە ڕۆمەکان بجەنگن، لەو جەنگەدا (جعفر) ئاڵاکەی بەدەستی ڕاستەوە گرتبوو شمشێرێک درا لە دەستی و دەستی بڕا، بۆیە بە دەستی چەپ ئاڵاکەی گرتەدەست، پاش کەمێکی تر درا لە دەستی چەپیشی و هەردوو دەستی بڕا، دواتر شەهید کرا.

کاتێک ئەم ڕووداوانە ڕوویاندەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە (مدینة)

لەلایەن پەروەردگارەوە هەواڵی پێدەدراو دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای ژن و منداڵەکانی (جعفر) و دڵی پڕ بوو بۆیان و نازی دەکێشان. دوای سێ ڕۆژ داوای سەرتاشی کرد و سەرتاش هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد سەری کوڕەکانی (جعفر)ی چاک کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو : (جعفر)م بینی لە بەهەشتدا لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕی.

**پرسیار:**

١- (جعفر) بە چی ناسرابوو؟

٢- بۆچی بێباوەڕانی قورەیش چوون بۆ لای (نجاشي)؟

٣- (جعفر) لە (حبشة) چی دەکرد؟

٤- پێغەمبەر(ﷺ) بە هاتنەوەی (جعفر) بۆ (مدينة) چی فەرموو؟

٥- هەڵوێستی (نجاشي) بەرانبەر بە موسڵمانان و پێغەمبەر(ﷺ) باس بکە.

٦- چ پەندو وانەیەک لە کۆچی (حبشة)دا فێر بوویت؟

## ١٨- (سعد بن أبي وقاص)(رضي الله عنه)

ژمارەیەک گەنج لە (مكة)دا هەبوون کە هەر لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلامدا موسڵمان بوون، ئەوانە بوونە پێشەوای خەڵکی و پەپوولەی دەوری پێغەمبەر(ﷺ). یەکێکیش لەوانە (سعد بن أبي وقاص) بوو. (سعد) لە کۆچەریەکانە، تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو کە موسڵمان بوو.

(سعد) چوارەم یان شەشەم کەس بوو موسڵمان بوو. (سعد) دەڵێت: سێ ڕۆژ پێش موسڵمان بوونم خەوم بینی لە تاریکییەکدام و هیچ نابینم، مانگێک ڕووناکی بۆ کردم، منیش شوێنی کەوتم: و تەماشام دەکرد بزانم کێ پێش من ئەو مانگەی دیوە، تەماشام کرد، (زید) و (علي) و (أبوبكر) لەوێن، پرسیارم کرد کەی گەیشتوونەتە ئەوێ؟

وتیان: ئێستا. دواتر بیستم پێغەمبەر(ﷺ) بە نهێنی بانگەواز دەکات، چووم لە شیوێک بینیم نوێژی عەسری دەکرد، لەوێ گوێم لێگرت و باوەڕم پێهێنا.

(سعد) لەسەر دەستی (أبوبكر الصديق) بانگەوازی ئیسلامی

وەرگرت، کاتێک (أبوبكر) موسڵمان بوو، چوو بۆ لای (عثمان بن عفان) و (طلحة بن عبيد الله) و (الزبير بن العوام) و (سعد بن أبي وقاص) و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش موسڵمان بوون.

(سعد) دەڵێت: من زۆر لەگەڵ دایکم چاک بووم، جا کاتێک موسڵمان بووم دایکم وتی: ئەی (سعد) ئەم دینە چیە هێناوتە؟ یان واز لەو دینە دێنیت، یان من خواردن و خواردنەوە لە خۆم حەرام دەکەم، تا دەمرم و بەو هۆیەوە لەبەر من ئابڕووت دەچێت و دەڵێن: تۆ بوویتە هۆکاری مەرگی دایکت.

منیش وتم: دایە گیان ئەوە مەکە، من واز لە دینەکەم ناهێنم. ئەوەبوو ڕۆژێک دەستی گرتەوە لە خواردن و خواردنەوە، بۆ بەیانییەکەی زۆری بۆ هاتبوو، منیش کە ئەوەم بینی وتم: دایە گیان بەخوا، ئەگەر سەد گیانت هەبێت و یەک یەک هەموویان دەربچن واز لە دینەکەم ناهێنم، جا ئەگەر پێت خۆشە بخۆ و پێشت خۆشە مەخۆ، دایکم کە زانی وا سوورم دەستی کردەوە بە نان خواردن.

پەند و وانە:

چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکدا واجبە، تەنانەت ئەگەر دایک و باوکیشمان بێباوەڕ بن هەر دەبێت لەگەڵیاندا چاک

بین و نەیانڕەنجێنین، بەڵام نابێت لە کاری خراپە و بێباوەڕیدا گوێڕایەڵییان بکەین، چونکە فەرمانی خوا لە پێش فەرمانی ئەوانەوەیە.

(سعد) هاودەم لەگەڵ (عمیر)ی برای کۆچیان کرد بۆ (مدینة)، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان (سعد بن أبي وقاص) و (سعد بن معاذ)ەوە.

(سعد) یەکەم کەس بوو لە ڕێی خوادا تیری هاویشت، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بچێت بۆ غەزای بەدر و لە نزیک بەدر دابەزی، (سعد) و (علي) و (زبیر)ی نارد، تا هەواڵی قورەیش وەربگرن.

(سعد) لە غەزای بەدردا بەشداری کرد، (سعد) دەڵێت: پێش ئەوەی بچین بۆ بەدر، (عمیر)ی برامم بینی خۆی دەشاردەوە. وتم: براکەم ئەوە چیتە؟ وتی: ترسی ئەوەم هەیە پێغەمبەر(ﷺ) بمبینێت و بە بچووکم بزانێت و نەهێڵێت بەشداری غەزاکە بکەم، حەزیش دەکەم بێم و بەشدار بم، بەڵکو خوا شەهیدیم پێ ببەخشێت، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی بە بچوک زانی و گێڕایەوە، (عمیر) دەستی کرد بە گریان، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا، منیش بینیم هێندە بچووکە خۆم جلە سەربازیەکەیم بۆ ڕێکدەکرد، لە غەزاکەدا شەهید بوو.

هەروەها (سعد) یەکێکە لە بەشداربووانی غەزای ئوحود، (سعد) دەڵێت: لەو غەزایەدا دوو کەسم بینی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوون و دەجەنگان و بەرگرییان لێدەکرد، جلی سپییان لەبەر بوو، نەپێشتر ئەو دوو کەسەم دیبوون و نە دواتر بینینمەوە، واتە فریشتە بوون.

(سعد) دەڵێت: لە غەزای ئوحوددا کە خەڵکی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) تەکینەوە، منیش کەنارم گرت و وتم: خۆم دەدەمە بەر ئەو لێشاوە، یان شەهید دەبم، یان ڕزگار دەبم، تا دەگەم بە پێغەمبەر(ﷺ). لەو کاتەدا (مقداد) وتی: ئەی (سعد) ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بانگت دەکات.

وتم: لە کوێیە؟ (مقداد)یش بە ئاماژە پێی نیشان دام، منیش چووم بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) لەپێش خۆیەوە داینیشاندم و تیرم دەهاویشت و دەموت خوایە، ئەمە تیری خۆتە، بیدە لە دوژمنی خۆت و دوژمنی پێغەمبەرەکەت. پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو: (خوایە، نزاکەی (سعد) گیرا بکە، خوایە، هاویشتنەکەی بپێکێت، ئادەی (سعد)، بەدایک و باوکمەوە بەقوربانت بم). ئیتر چی تیرێکم دەهاویشت پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆ دەکردم، تا هەموو تیرەکانم تەواو بوون، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) تیرەکانی خۆی دەدایە دەستم.

هەروەها لە غەزای خەندەق و ڕێککەوتنی حودەیبیە و فەتحی (مکة) و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.

(سعید بن زید)دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر (ﷺ) لە بەهەشتدایە، (أبوبکر) لە بەهەشتدایە، ... (سعد بن أبي وقاص) لە بەهەشتدایە..)،

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (یەکەم کەس لەم دەرگاوە دێتە ژوورەوە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشت)، ئەوەبوو: (سعد بن أبي وقاص) هاتە ژوورەوە.

دایکی باوەڕداران (عائشة) دەڵێت: شەوێک پێغەمبەر(ﷺ) کە هاتبوویە (مدینة) ماندوو بوو، فەرمووی: (خۆزگە ئەمشەو پیاو چاکێک لە هاوەڵانم پاسەوانی دەکردم). دەنگی چەکێکمان بیست، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئەوە کێیە؟

وتی: من (سعد بن أبي وقاص)م هاتوم، تا پاسەوانیت بکەم. ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) خەوت، تا ئەوەی دەنگی پرخەی دەبیسترا.

(سعد) دەڵێت: جارێک لە (مکة) نەخۆش کەوتم: و پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام، دەستی خستە سەر تەوێڵم و دەستی هێنا بە دەموچاو و سنگ و سکمدا و فەرمووی: (خوایە، شیفای (سعد) بدەو هیجرەتەکەی بۆ تەواو بکە)، تا

ئێستاش هەست بە ساردی جێدەستی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەم لەسەر جەرگم.

کاتێك (أبوبكر الصديق)بوو بە خەلیفە، دژ بە هەڵگەڕاوەکان جەنگی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر (مدينة) دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری (مدينة)دا دانا و بڕێک کەسی کرد بە ئەمیری دەستە دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش (علي بن أبو طالب) و (الزبير بن العوام) و (عبدالرحمن بن عوف) و (طلحة بن عبيد الله) و (سعد بن أبي وقاص) و (عبدالله بن مسعود).

دوای ئەوەش (سعد) بەشداری هەموو جەنگ و جیهادی موسڵمانانی دەکرد و ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، کاتێک (عمر بن الخطاب) بریندار کرا، بڕیاری دا شەش کەس دیاری بکات، تا لەنێو خۆیاندا خەلیفەیەک هەڵبژێرن، یەکێک لەو شەش کەسە (سعد بن أبي وقاص) بوو.

دواجار (سعد) لە ساڵی پەنجاو پێنجی کۆچیدا وەفاتی کرد، تەرمەکەی برا بۆ (مدينة)، (مصعب)ی کوڕی دەڵێت: کاتێک باوکم لەسەرەمەرگدا بوو سەری لە کۆشمدا بوو، منیش دەستم کرد بە گریان، باوکم سەری بەرز کردەوەو وتی: کوڕە ئازیزەکەم بۆچی دەگریت؟ وتم: بابە گیان بۆ تۆ، وتی مەگری، چونکە

خوا هەرگیز سزای من نادات، من لە ئەهلی بەهەشتم، دواتر داوای جبەیەکی خوری کرد و وتی لەمەدا کفنم بکەن، چونکە بەم جبەوە بەشداری غەزای بەدرم کردووە، لەو کاتەوە ئەم جبەم هەڵگرتووە و شاردوومەتەوە بۆ ئەم ڕۆژەم.

**پرسیار:**

١- هۆکاری موسڵمانبوونی (سعد) چی بوو؟
٢- ڕۆڵی (سعد) لە غەزای ئوحوددا باس بکە.
٣- کاتێک (سعد) نەخۆش کەوت، پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟
٤- پاسەوانییەکەی (سعد) بۆ پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟
٥- داواکاری (سعد) لە سەرەمەرگیدا چی بوو؟

## ١٩- (عمار بن یاسر)(ﷺ)

ژمارەیەک لە هاوەڵان هەبوون لە (مکة)دا ئازار و ئەشکەنجەی زۆر دران و لەبەرئەوەی کەسێک نەبوو پشتیوانییان بکات، بۆیە بێباوەڕان بە هەموو چەشنێک ئازاریان دەدان، یەکێک لەوانەش (عمار بن یاسر) بوو، هەم خۆی و هەم باوک و دایکیشی موسڵمان بوون و هەرسێیان لەسەر موسڵمانبوونیان ئازار و ئەشکەنجەی زۆریان تووش بوو.

ئەم خێزانە سەرەتا لە (الیمن) دەژیان، (یاسر)ی باوکی هات بۆ (مکة) و لای (أبو حذیفة) مایەوە، ئەویش کەنیزەکێکی هەبوو بە ناوی (سمیة) و ئەو کەنیزەکەی لێ مارە کرد، منداڵێکیان بوو بە ناوی (عمار)، ئیتر (أبو حذیفة) (یاسر)ی ئازاد کرد، دواتر (أبو حذیفة) وەفاتی کرد. دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پەیامی خوای بۆ هات، (عمار) هاودەم بە دایک و باوکی و (عبدالله)ی برایشی موسڵمان بوو.

**پەند و وانە:**

سوپاس و ستایشی خوای دەوێت کاتێک دەبینین هەم خۆمان و هەم دایک و باوکمان موسڵمانن و ڕێی ڕاستییان گرتووەتەبەر، هەروەها سوپاسی خوا دەکەین کەناڕەحەتی لەسەر لابردوین و ئێستا بەو شێوازەی سەردەمانی زوو لەسەر موسڵمانبوونمان ئازارمان نادەن، ئەگەریش هەر ئازار و ناڕەحەتیەکمان بێتەڕێ، نابێت واز بهێنین لە ئایینەکەمان.

هەریەک لە (سمية) و (ياسر)ی هاوسەری و (عمار)ی کوڕی لە یەکەمین موسڵمان بووەکان بوون، (سمية)ی دایکی حەوتەم کەس بوو موسڵمان بوو و یەکەم شەهیدی ناوی ئیسلام بوو، چونکە کاتێک (سمية) موسڵمان بوو، (أبو جهل) لەسەر موسڵمانبوونەکەی زۆر ئازاری دەدا، جلی ئاسنینی دەکردە بەری و لەبەر گەرمای (مکة)دا سزای دەدا، (سمية)ش ئافرەتێکی پیری لاواز بوو.

جارێک (أبو جهل) کە سزای (سمية)ی دەدا، هات و بە خەنجەرێک دای لە سکی و شەهیدی کرد.

(عمار) یەکێک بوو لەو حەوت کەسە یەکەمەی کە لە (مکة) ئیمانی خۆیان ئاشکراکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە: پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبكر) و (بلال) و (صهيب) و (خباب) و (عمار) و (سمية).

ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ (عثمان بن عفان)دا بوو،

گەیشتنە لای (عمار) و دایک و باوکی کە سزا دەدران.

باوکی (عمار) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژگار ئاوایە. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (خۆڕاگر بە)، پاشان فەرمووی: خوایە، لە بنەماڵەی (یاسر) خۆش بە، هەروەها پێی فەرموون: (خۆڕاگر بن ئەی خێزانی (یاسر)، وادەتان بەهەشتە).

بێباوەڕان هێندە سزای (عمار)یان دا، تا ناچاریان کرد قسە بڵێت بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا وازیان لێهێنا. دواتر کە(عمار) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پرسی؟ (عمار) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وازم لێنەهێنرا، تا قسەم بە تۆ وت و بە چاکە باسی خواوەندەکانی ئەوانم کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دڵت چۆن بوو؟)

وتی: دڵم پڕ بوو لە ئیمان.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر هەمدی ناچاریان کردی وا بکەرەوە).

(عمار) دواتر کۆچی کرد بۆ (مدینة) و لە هەریەک لە غەزاکانی بەدر و ئوحود و خەندەق و بەیعەتی ریزوانیشدا بەشداری کرد.

(عمار) یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا مزگەوتی دروست کرد، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێی کۆچدا بوو، (عمار) وتی: دەبێت شوێنێک هەبێت بۆ سێبەر و نوێژکردنی

پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە بە بەرد مزگەوتی قوبائی دروست کرد.

کاتێک بڕیار درا مزگەوتی (مدینة) دروست بکرێت، هاوەڵان هەموو ئیشیان تێدا دەکرد، هەموان یەک یەک خشتیان دەبرد، بەڵام (عمار) دوو دوو خشتی هەڵدەگرت، جا پێغەمبەر(ﷺ) کە (عمار)ی بینی خۆڵەکەی سەر شان و دەموچاوی دەتەکاند.

(خالد بن ولید) دەڵێت: جارێک لەگەڵ (عمار بن یاسر)دا دەمەبۆڵەیەکمان بوو، (عمار)یش چوو، تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵام لەسەر بکات، منیش هەر لێی تووڕە دەبووم، پێغەمبەریش(ﷺ) بێدەنگ بوو. ئیتر (عمار) دەستی کرد بە گریان و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێت لێیە چیم پێ دەڵێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) سەری بەرە و ڕووی من بەرزکردەوە و فەرمووی: (هەرکەس دژایەتی (عمار) بکات خوا دژایەتی دەکات و هەرکەسیش ڕقی لێی بێت خوا ڕقی لێی دەبێت). منیش خێرا دەرچووم و ئیتر لەو ساتەوە هەموو هەوڵم بۆ ئەوە بوو (عمار) ڕازی بکەم، خێرا خۆم گەیاند بە (عمار) و ڕازیم کرد.

(علي بن أبو طالیب) دەڵێت: جارێک لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین کە (عمار) هات و داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مۆڵەتی بدەن، مەرحەبا لە پاکی پاکی پێبەخشراو).

(عائشة)ی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ)

فەرمووی: (عمار) هەر کات دوو پرسی بۆ بخرێتە ڕوو، دروستترینیان هەڵدەبژێرێت).

(عمار) دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە خیلافەتی (أبوبکر الصدیق)دا بەشداری جەنگی دژ بە هەڵگەڕاوەکانی کرد و لە جەنگی یەمامەدا هاواری دەکرد ئەی گرۆی موسڵمانان لە بەهەشت ڕادەکەن، من (عمار بن یاسر)م، دەی وەرن.

(عمر بن الخطاب)، (عمار بن یاسر)ی هاودەم بە (إبن مسعود) نارد بۆ عێراق و ئەرکی کارگێڕی و مامۆستایی پێ بەخشین و نامەیەکی هاودەم بەوان نارد بۆ خەڵکەکە و تیایدا نووسیبووی: من دووانم لە کەسە ناوازەکانی ناو هاوەڵان بۆ ناردون کە بەشداربووی بەدر بوون، گوێڕایەڵیان بن و پێشەنگییان پێوە بکەن، من لەبەر ئێوە خۆم لە نزیکی ئەو دووانە بێبەش کردووە.

(عمار) لە سەردەمی (علي بن أبو طالیب) دا کەسی نزیک و هاودەم و پشتگیری خەلیفە بوو، کاتێک جەنگی (صفین) لەنێوان موسڵماناندا ڕوویدا و ئاژاوەگێڕان توانییان نێوانی موسڵمانان تێکبدەن، (عمار) لەو جەنگەدا شەهید بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) مژدەی دابوو کە (عمار) لەسەر حەقە و ئەو سوپایەی ئەوی تێدایە حەقە، بەوەش دەرکەوت پێشەوا

(علي) لەسەر حەق بووەو پێشەوا (معاوية) لەو بوارەدا ڕاستی نەپێکاوە.

**پرسیار:**

١- (یاسر)ی باوکی (عمار) بە بنەڕەت خەڵکی کوێ بوو؟

٢- دایکی (عمار) کێ بوو؟ چی لێهات؟

٣- بۆچی (عمار) قسەی وت بە پێغەمبەر(ﷺ)؟

٤- فەرموودەی دایکە (عائشة) سەبارەت بە (عمار) باس بکە.

٥- بە شەهیدبوونی (عمار) چی ڕوون بوویەوە؟

## ٢٠- (مقداد بن اسود)(رضي الله عنه)

ئەمجارەش دەچینە خزمەتی یەکێکی تر لە هاوەڵە ئازیز و خۆشەویستەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە ئەویش ناوی (مقداد بن عمرو)، بەڵام زیاتر بە (مقداد بن اسود)ناسراوە.

ئەم هاوەڵە زۆر زوو لە (مکة) موسڵمان بوو و دواتر کۆچی کرد بۆ (حبشة)، دواتر گەڕایەوە بۆ (مکة)، بەڵام نەیتوانی کۆچ بکات بۆ (مدینة). (مقداد) لە (مکة)دا ئازاری زۆری چەشت و بێباوەڕان سزایان دەدا، بەرگی ئاسنینی دەکرایە بەر و دەبرایە بەر گەرمای خۆر، ئەویش گەرمای سەختی (مکة).

دوای ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچی کرد بۆ (مدینة)، سوپایەکی بە سەرکردایەتی (عبیدة بن الحارث) نارد و سوپاکە گەیشتن بە دەستەیەکی بێباوەڕان کە (عکرمة بن أبي جهل)سەرکردایەتی دەکرد، (مقداد) و (عتبة بن غزوان)یش لەگەڵ بێباوەڕاندا دەرچووبوون، تا خۆیان بگەیەنن بە موسڵمانان کەهەردوولا بەیەکگەیشتن و جەنگ ڕووی نەدا، (مقداد) و (عتبة) دایانە پاڵ موسڵمانان.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە برایەتی خستە نێوان (مقداد) و (جبار بن صخر)ەوە.

(مقداد) یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر و ئەسپێکی پێ بوو، لە غەزای ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.

(إبن مسعود) دەڵێت: لە غەزای بەدردا لەگەڵ (مقداد بن اسود)بووم کە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەریش(ﷺ) نزای دەکرد لە بێباوەڕان، (مقداد)یش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە لە ڕاست و چەپ و پێش و دواتەوە دەجەنگین و پشتت بەرنادەین، پێغەمبەریش(ﷺ) لە خۆشی ئەو قسەی دەموچاوی دەگەشایەوە.

(مقداد) دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەگەر لەگەڵ کەسێکی بێباوەڕ بەیەک گەیشتین و ئەو بە شمشێر دەستێکی منی پەڕاند، دواتر درەختێک کەوتە نێوانمان و دوای ئەوە وتی: من موسڵمان بووم، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا دوای ئەو وتەی بیکوژم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نا مەیکوژە).

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستیشی پەڕاندبم؟

فەرمووی: (مەیکوژە، ئەگەر کوشتت ئەوە تۆ دەچیتە شوێنی ئەو پێش ئەوەی بیکوژیت و ئەویش دەچێتە شوێنی تۆ پێش ئەوەی ئەو قسەیە بڵێت).

ئەمە هاندانێکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، تا بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ موسڵماندا نەجەنگین و بیانوو نەدۆزینەوە بۆ جەنگ و دژایەتی لەگەڵ خوشک و برای موسڵمانماندا، چونکە خوای گەورە بناغەی برایەتی نێوان موسڵمانانی داناوە و هەر بێباوەڕێکیش شایەتومانی هێنا، یەکسەر دەبێت بە برای موسڵمانان.

(مقداد) بەسەرهاتێکی خۆی و دوو هاوڕێی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێک من و دوو هاوڕێم لە تاو ماندوویی و برسێتی تەواو هیلاک بووبووین، چووین، تا میوانی هاوەڵانێکی پێغەمبەر(ﷺ) بین، بەڵام کەس نەیبردینەوە. چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ئێمەی بردەوە ماڵەوە، سێ بزنیان هەبوو فەرمووی ئەو شیرە لە نێوانماندا دابەش بکەن، هەرکاممان بەشی خۆی دەخوارد، بەشەکەی پێغەمبەریشمان(ﷺ) برد بۆ چەند جار ئاوامان دەکرد، شەو دەهاتەوە و سەلامێکی دەکرد کە خەوتووی بێدار نەدەکردەوە و هەر کەسیش نەخەوتبوایە، دەیبیست. ئینجا دەچوویە مزگەوت و نوێژی دەکرد و دواتر دەهاتەوە شیرەکەی دەخواردەوە. شەوێک شەیتان هاتە بنکڵیشەم، کە بەشەکەی خۆمم خواردەوە پێی دەوتم: (محمد) دەچێت بۆ

لای پشتیوانان و ئەوانیش زۆر ڕێزی دەگرن و چی پێویست بێت پێـــی دەبەخشـــن، هەڵیخەڵەتانـــدم و چـــووم بەشـــەکەی پێغەمبەریشـم(ﷺ) خـواردەوە، جـا کە شـیرەکە گەیشـتە نـاو گەدەم و دڵنیـا بـوومەوە کە هـیچ ڕێیەکـی گەڕانەوەی نیـیە، پەشیمان بوومەوە و شەیتانیش ڕێی پەشیمانی دەخستە بەرم. پێی دەوتم: ماڵوێران چیت کـرد؟ شیرەکەی (محمد)ت خواردەوە؟ جا خۆ ئێستە دێتەوە و دەبینێت شیرەکەی نەماوە نزات لـێ دەکـات و دنیا و ئاخیرەتیشت دەفەوتێت، منیش پارچە بەتانییەکم دابوو بە خۆمـا، ئەوەنە بچـووک بـوو کە بمدایە بەسـەر سـەرمدا قـاچم دەردەکەوت و، ئەگەر بمـدایە بەسـەر قاچمـدا سـەرم دەردەکەوت، خەویـش لە چاوانم تۆرابـوو، بەڵام دوو هـاورێکەی تـرم خەوتـن و ئەوەی من کردم ئەوان نەیانکرد. پێغەمبەر(ﷺ) هـاتەوە و وەک جاران سەلامێکی نەرمی کرد، ئینجا چوویە مزگەوت و نوێژی کرد و دواتر هات، تا شیرەکەی بخواتەوە، کەچـی بینـی نەمـاوە، سـەری بەرەو ئاسـمان بەرزکـردەوە. وتـم: بەخـوا ئێسـتا نـزام لـێ دەکـات و مـاڵ وێـران دەبـم. ئینجـا فەرمـووی: (خـوایە، ئەوەی خواردنم پـێ دەدات خواردنی پـێ بـدەیت، ئەوەی خواردنەوەم پـێ دەدات خـواردنەوەی نـۆش بکەیـت). منـیش تونـد بەرگەکەم دا بەسەر خۆمدا و چەقۆیەکم هەڵگرت و چووم بۆ لای بزنەکـان تـا بزانم کامیـان قەڵەوتـرە سـەری ببڕم بۆ پێغەمـبەر(ﷺ)، دەبیـنم هەر سـێ بـزنەکە گوانیـان پـڕە لە شـیر. چـووم قـاپێکی مـاڵی پێغەمـــبەرم(ﷺ) هێنـــا و پـــڕم کـــرد لە شـــیر، بـــردم بـــۆ

پێغەمبەر (ﷺ). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەمشەو شیرەکەی خۆتان خواردەوە؟)

وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

فەرمووی: بخۆرەوە، ئەویش شیرەکەی خواردەوە، دواتر هەندێکی هێشتەوە و دای بە من.

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخۆرەوە، ئەویش هەمدی لێی خواردەوە و هەندێکی مابوو دای بە من که زانیم پێغەمبەر (ﷺ) تێری خواردەوە و نزاکەی منی گرتەوە، ئەوەندە پێکەنیم، تا کەوتمە سەر زەویەکە. ئینجا مەسەلەکەم باسکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) .پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە تەنها رەحمەتێک بوو لە خواوە، بۆچی پێت نەوتم؟ تا دوو هاورێکەی تریشمان بێدار بکردایەتەوە و ئەوانیش لێیان بخواردایەتەوە.

(مقداد) دوای وەفاتی پێغەمبەریش (ﷺ) ژیا و بەردەوام سەرقاڵی پەرستش و کاری چاکە بوو، بەشداری جەنگ و جیهادی رێی خوای دەکرد، خێر و بەخششی زۆری دەکرد، بەتایبەت پێش وەفاتی پارەیەکی زۆری بەخشی بە (حسن) و (حسین)ی کوڕانی (علي) کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕەیحانەکانی خۆی ناوی دەبردن.

دواجار (مقداد) لە ساڵی سی و سێی کۆچی و لە خیلافەتی (عثمان بن عفان) و لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**پرسیار:**

١- (مقداد) چۆن خۆی گەیاندە موسڵمانان؟

٢- ئەو پرسیار و وەڵامەی لەنێوان (مقداد) و پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوو چۆن بوو؟

٣- (مقداد) لە غەزای بەدردا چی وت؟

٤- بەسەرهاتی شیرخواردنەوەکەی (مقداد) چۆن بوو؟

٥- لە ژیانی (مقداد)ەوە چی فێر بوویت؟

## ٢١- (أسيد بن حضير)(رضي الله عنه):

لە شاری (مدينة)دا کابرایەک هەبوو بە ناوی (حضير). ئەم کـابرایە لە ئەوسـیەکان بـوو و یەکێـک بـوو لە سـوارچاک و کەسە بەهێزەکانی مەیدانی جەنگ. هێندە ناسراو و خاوەن پێگە بـوو کە قەڵایەکـی تـایبەت بە خـۆی هەبـوو، لە جەنگەکانـدا سەرکردایەتی سوپای ئەوسیەکانی دەکرد.

ئەم پیاوە منداڵێکی هەبوو بە ناوی (أسيد)، (أسيد) بەرەبەرە گەورە دەبوو، تـا ئەوەی ڕۆژێـک بـاوکی مـرد، بـاوکی بتپەرست بـوو و هێشـتا ئـایینی ئیسـلام نەگەیشـتبوویە (مدينـة)، بەڵام (أسيد)ی کـوڕی ژیـا، تـا ئیسـلام گەیشتە (مدينـة) و موسـڵمان بوو.

(أسيد) یەکێـک بـوو لەو هـاوەڵە پشـتیوانیانەی کە زۆر زوو موسـڵمان بـوو، موسـڵمانبوونەکەشـی لەسـەر دەسـتی (مصعب بن عمير) بوو.

جارێک (أسعد بن زرارة) (مصعب)ی برد، تـا باسـی ئیسـلام

بكات بۆ خه‌ڵكی، به‌ڵام (سعد بن معاذ) و (أسيد بن حضير) كه گه‌وره‌ی هۆزه‌كانیان بوون و هێشتا موسڵمان نه‌بووبوون، ئه‌وه‌یان پێ ناخۆش بوو و ویستیان ڕێیان پێ نه‌ده‌ن. كاتێک قسه‌كانی (أسعد) و (مصعب)یان بیست (سعد) به (أسيد)ی وت هه‌ی بێ باوک بڕۆ بۆیان، سه‌یركه چۆن هاتوونه‌ته خاكمان، تا هه‌رزه‌كاره‌كانمان له خشته‌به‌رن، بڕۆ به‌ریان پێ بگره و مه‌هێڵه بێنه ناوچه‌ی ئێمه. (أسيد)یش به خه‌نجه‌رێكه‌وه هات، (أسعد) به (مصعب)ی وت ئه‌مه گه‌وره‌ی هۆزه‌كه‌یه‌تی، دێت بۆ لات، ڕاست په‌یامی خوای پێ بڵێ. (مصعب) وتی: ئه‌گه‌ر دابنیشێت قسه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌كه‌م. (أسيد) به قسه وتنه‌وه هاته به‌رده‌میان، وتی: بۆچی هاتون بۆ لامان، تا هه‌رزه‌كاره‌كانمان له خشته‌به‌رن، ئه‌گه‌ر گیانی خۆتانتان لا خۆشه‌ویسته دووربگرن لێمان.

(مصعب) پێی وت: بۆچی دانانیشیت، تا گوێمان لێ بگریت، ئه‌گه‌ر به‌دڵت نه‌بوو وازدێنین.

ئه‌ویش وتی: قسه‌كه‌ت جوانه، خه‌نجه‌ره‌كه‌ی ده‌ستی داچه‌قاند به‌ناو زه‌ویدا و له‌به‌رده‌میاندا دانیشت. (مصعب) باسی ئیسلامی بۆ كرد و قورئانی بۆ خوێنده‌وه. (أسيد) وتی: قسه‌كانتان چه‌ند جوان و چاكن، باشه، ئه‌گه‌ر بتانه‌وێت بچنه ناو ئه‌م ئایینه‌وه چی ده‌كه‌ن؟

ئەوانیش پێیان وت: خۆت بشۆ و جلەکانت بشۆ و دواتر شایەتومانی حەق بهێنە و دواتر نوێژ بکە. ئەویش وایکرد، ئینجا (أسید) وتی من کەسێکم لەگەڵە، ئەگەر ئەویش شوێنتان بکەوێت چی کەسی ناو هۆزەکەی هەیە شوێنتان ئەکەون، ئێستا ئەینێرم بۆ لاتان، ئەویش (سعد بن معاذ)ە. ئینجا (أسید) خەنجەرەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای (سعد) و هۆزەکەشی چاوەڕوان بوون. (سعد) پێی وت چیت کرد؟

(أسید) وتی: من قسەم لەگەڵ کردن بەخوا وای نابینم خراپ بن، ڕێم لێگرتن.

ئەوانیش وتیان: چیت پێ خۆشە وادەکەین. (سعد) تووڕە بوو و هەستا و خۆی چوو بۆ لایان، کە چوو بینی هەردووکیان بێخەم دانیشتون، زانی (أسید) ویستوویەتی گوێیان لێ بگرێت، بە جنێودانەوە لەبەردەمیاندا ڕاوەستا. بە (أسعد بن زرارة)ی وت: بەخوا لەبەر خزمایەتی نێوانمان نەبوایە، ئەمەت بەسەردا تێنەئەپەڕی. (مصعب) پێی وت: بۆچی دانانیشیت گوێمان لێ بگریت، ئەگەر بەدڵت بوو باشە، ئەگەر بەدڵت نەبوو لێت دووردەکەوینەوە. (سعد) وتی: قسەکەت جوانە، دانیشت و خەنجەرەکەی داچەقاند بە زەویدا و گوێی لێگرتن، هەمان شتیش بۆ ئەم ڕوویدا کە (سعد) گەڕایەوە. هۆزەکەی وتیان: بەو خوایە، (سعد) بە دەموچاوێکی ترەوە هاتووەتەوە، کاتێک (سعد)

گەیشتە لایان وتی ئەی هۆزەکەم منتان پێ چۆنە؟
وتیان: گەورە و شارەزا و بەڕێزترینی ئێمەیت.
ئەویش وتی: قسە لەگەڵ هیچ کامتان ناکەم، تا ئەو کاتەی باوەڕ دێنن بە خوا و پێغەمبەرەکەی، بەوە هەر هەموو هۆزەکەی موسڵمان بوون جگە لە چەند کەسێک.
کاتێک پشتیوانان جاری دووەم چوون بۆ (مکـة) و لە بەیعەتی عەقەبەدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتن، (أسید)یش لەگەڵیاندا چوو و یەکێک بوو لە بەشداربووەکان و یەکێکیش بوو لە نەقیبەکان.
کاتێک پێغەمبەر(ﷺ)کۆچی کرد بۆ (مدینة) و برایەتی خستە نێوان پشتیوانان و کۆچەرانەوە، برایەتی خستە نێوان (أسید بن حضیر)و (زید بن حارث)ەوە.
پێغەمبەر(ﷺ) زۆر لە (أسید) ڕازی بوو و بە هاوەڵانی تری دەفەرموو: (أسید بن حضیر) پیاوێکی باشە.
پرسیار: بۆچی (أسید) لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد؟
وەڵام: چونکە هەم (أسید) و هەم هاوەڵانێکی تریش نەیاندەزانی جەنگی بەدر ڕوودەدات، ئەگینا بەشدارییان دەکرد.
دوای ئەوە (أسید) لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و هێندە جەنگا، تا بە دەستی بێباوەڕان حەوت جار برینداز کرا، دوای ئەوەش هەر غەزایەکی تر ئەنجام بدرایە، خێرا (أسید) دەچوویە

نێو سوپاکەوە و بەشداری دەکرد، تا دوژمنانی ئیسلام شکست پێ بهێنێت.

لە غەزای تائیفدا کاتێک یەکێک لە کۆیلەکان بە ناوی (إبراهیم بن جابر) موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) سپاردیە دەست (أسید) و (أسید)ی ڕاسپارد، تا هاوکاری ماددی بکات و پێویستیەکانی بۆ دابین بکات و زانست و زانیاریشی فێر بکات.

**پەند و وانە:**

پێویستە لە هەموو کات و شوێنێکدا بیرمان لای بانگەوازی ڕێی خوا بێت، نەوەک لە هەندێک کاتی نائاسییدا بڵێین ئێستا کاتی نییە، بەڵکو تەنانەت لە کاتی جەنگیشدا پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی هانداوە، تا زانست و پەیامی خوا فێری کەسانی تازە موسڵمان بوو بکەن. هەروەها گرنگیش بدەن بە لایەنی ماددی و پێویستیەکانی ژیانیان، چونکە موسڵمان دەبێت پشت و هاوکاری برا موسڵمانەکەی بێت.

(أنس بن مالك) دەڵێت: لە شەوێکی تاریکدا دوو کەس لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) چوونە دەر و لە بەردەمی ئەو دوو کەسەوە ڕووناکیەک هەبوو، تا ئەو شوێنەی لەیەک جیابوونەوە

کە جیابوونەوە ڕووناکیەکەش لە نێوانیاندا دابەش بوو و هەر بەشێکی لەگەڵ یەکێکیاندا بوو، ئەو دوو کەسەش بریتی بوون لە (أسید بن حضیر)و (عباد بن بشر).

جارێک (أسید) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باسی هەژاری ماڵێکی پشتیوانانی بۆ کرد، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) چی خواردنی لابوو دابەشی کردبوو. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (پێت نەوتین، تا چی لە دەستماندا هەبوو نەما، ئەمجار بیستت شتێکمان بۆ هاتووە وەرە و ئەو ماڵەم بیر بخەرەوە). دوای ماوەیەک بڕێک خواردن هات بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە گەنم و خورما بوو و لە خەیبەرەوە بۆی هاتبوو، زۆربەی کەسەکانی ئەو ماڵە هەژارەش ئافرەت بوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خواردنەکەی بەسەر خەڵکدا دابەش کرد و بەشی زۆر باشی بۆ ئەو ماڵە دانا، (أسید) سوپاسی پێغەمبەری(ﷺ) کرد و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە لەبری ئێمە چاکترین پاداشتت بداتەوە). پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (ئێوەش ئەی کۆمەڵی پشتیوانان خوای گەورە چاکترین پاداشتتان بداتەوە، هێندەی من سەبارەت بە ئێوە بیزانم زۆر پاک و خۆڕاگرن).

**پەند و وانە:**

پێویستە، ئەگەر زانیمان کەسێک، یان ماڵێک هەژارن، هەوڵ بدەین هاوکارییان بکەین، تا لەو نارەحەتیە ڕزگار بن، ئەگەر خۆمان بە تەنها نەمانتوانی، ئەوکات بە کەسانی تر بڵێین، تا هاوکار بن لە یارمەتیدانی ئەو کەسە، یان ئەو ماڵە هەژارەدا، چونکە مرۆڤەکان ئەگەر هاوکاری یەکدی نەبن ئەوە ژیان سەخت دەبێت و هەر جارە و یەکێکیان تووشی نارەحەتی دەبێت.

(أسید) زۆرجار لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بوو و گوێبیستی فەرموودەکانی بوو و فەرموودەشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕایەوە، دەما و دەم ئەو فەرموودانە باسکران، تا دواتر نووسرانەوە و ئەمڕۆ لەبەردەستی ئێمەدان.

شەوێک (أسید) لە ماڵەوە بوو قورئانی دەخوێند، سەرقاڵ بوو بە خوێندنی سوورەتی بەقەرەوە، ئەسپەکەشی لە نزیکیەوە بەسترابوویەوە، کاتێک قورئانی دەخوێند ئەسپەکەی حیلاندی و بەرز بوویەوە، (أسید) لە قورئان خوێندنەکەی وەستا، ئەویش بێدەنگ بوو، دووبارە (أسید) دەستی کردەوە بە قورئان خوێندنەکەی و ئەسپەکەش هەمدی حیلاندی و بەرز بوویەوە. دووبارە (أسید) بێدەنگ بوو و ئەسپەکەش بێدەنگ بوو، بۆ جاری سێیەم کە قورئانی خوێند ئەسپەکە دیسان حیلاندی و بەرز

بوویەوە و بڕێک جووڵا، (یحیی بن أسید)یش لە نزیک ئەسپەکەوە بوو. (أسید) ترسا ئەسپەکە (یەحیی)ی کوڕی بشێلێت، کاتێک ئەسپەکەی هێورکردەوە سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و شتێکی بینی، بۆ بەیانی (أسید) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باس و خواسەکەی بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (بتخوێندایە ئەی (أسید)، بتخوێندایە ئەی (أسید). (أسید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ترسام (یحیی) بشێلێت، چونکە (یحیی) نزیک بوو لە ئەسپەکەوە، کاتێک سەرم بەرز کردەوە و چووم بۆ لای، سەرم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە بڕێ شت وەک چراخان دیاربوون، منیش چوومەدەر، تا بیبینم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (دەشتزانی ئەوە چیە؟).

(أسید) وتی: نا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوانە فریشتەکان بوون نزیک بوویوونەوە بۆ بیستنی دەنگی تۆ، ئەگەر لە قورئان خوێندنەکەت بەردەوام بوویتایە بەیانیت دەکردەوە و خەڵکی سەیری فریشتەکەیان دەکرد و لەبەرچاویان ون نەدەبوون).

(أسید) پیاوچاکێکی ڕووخۆش و خوێن گەرم و قسەخۆش بوو، زۆرجار هاوەڵانی بە قسەخۆشەکانی دڵخۆش دەکرد،

جارێک (أسید) لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو کە قسەی خۆشی بۆ دەکردن، پێغەمبەر(ﷺ) دای بە کە لە کەیدا، ئەویش وتی: ئازارت دام، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆڵەی خۆت وەرگرەوە. (أسید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جا تۆ کراسێکت لەبەرە، بەڵام تۆ کە دات لە من بەسەر کراسەوە لێت نەدام، پێغەمبەریش(ﷺ) کراسەکەی هەڵکرد، (أسید)یش باوەشی کرد بە پێغەمبەردا(ﷺ) و ورگی ماچ دەکرد و دەیوت بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، ویستم ئاوا ماچت بکەم.

**پەند و وانە:**

قسەی خۆش و خۆشحاڵ کردنی هاوڕێ و دۆست و کەسە نزیکەکانمان خێرە و خوای گەورە پێی خۆشە، بۆیە نابێت موسڵمان کەسێکی مۆن و ڕووگرژ و قسە ناخۆش بێت، بەڵکو دەبێت خەڵکی بە بینینی دڵخۆش بن، بەڵام نابێت بە ناوی قسەی خۆشەوە قسەی ناڕەوا و درۆ و خراپ بوترێت، بەڵکو دەبێت سنووری چاکە نەبەزێنین.

(أسید) دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و بەشداری نوێژ و پەرستیش و کارە چاکەکان بوو، هەروەها بەشداری جەنگ و

غەزاکانی دەکرد، لە سەردەمی خیلافەتی (عمر بن الخطاب)یشدا بەشداری فەتحی (بیت المقدس)ی کرد، هەر لە سەردەمی خەلیفە (عمر)دا وەفاتی کرد. (أسید) پێش مردنی وەسیەتی کرد بۆ خەلیفە (عمر)، تا سەرپەرشتی ئیش و کاری بکات، خەلیفەش دارخورماکانی (أسید)ی بە چوار ساڵ فرۆشت بە چوار هەزار دینار و قەرزەکانی پێ دایەوە.

**پرسیار:**

١- باوکی (أسید) بە چی ناسرابوو؟

٢- (أسید) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- (أسید) بۆ ماچکردنی سکی پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟

٤- بۆچی،(أسید) وازی هێنا لە قورئان خوێندنەکەی؟

## ٢٢- (جریر بن عبدالله)(رضي الله عنه)

ئەمجارە باس لە هاوەڵێک دەکەین کە هێندە کەشخە و جوان بوو ناوبانگی دەرکردبوو و پێی دەوترا ئەڵێیت پێغەمبەر یووسفە. ئەم هاوەڵەش ناوی (جریر بن عبدالله)بوو و خەڵکی (یمن) بوو و گەورەی هۆزەکەی خۆی بوو.

(جریر) لە (الیمن)ەوە هات بۆ (مدینة) بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، (جریر) دەڵێت چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: بۆچی هاتویت؟

وتم: هاتوم، تا موسڵمان بم.

ئەویش جلەکەی خۆی ڕاخست بۆم و فەرمووی: (ئەگەر گەورە و ڕێزداری قەومێک هات بۆ لاتان ڕێزی بگرن).

**پەند و وانە:**

پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانی خۆیدا ڕێزی گەورە و بەرپرسی هۆز و ناوچەکانی دەگرت، چونکە ڕێزگرتنی ئەوان واتە ڕێزگرتنی ئەو ناوچەیە. دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی (جریر)ی گرتووە کە سەرۆکی هۆزەکەی خۆی بوو، هەروەها هاوەڵان و موسڵمانانی فێر کرد، تا ڕێزی گەورە و بەرپرسی خەڵک بگرن، بەڵام ڕێزگرتن بەو واتایە نا لەبەر ئەو کەسە سنووری خوا ببەزێنین.

(جریر) کەسێکی زۆر قۆز و کەشخە بوو. هێندە کەشخە بوو (عمر بن الخطاب) دەیوت (جریر)ە یووسفی ئەم ئوممەتەیە، واتە لە جوانیدا چووەتەوە سەر پێغەمبەر یووسف.

(جریر): دەڵێت کاتێک هاتمە (مدینة) و چوومە مزگەوت، پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی لێکردم و خەڵکەکەش بە زیتەی چاو سەیریان دەکردم، منیش بەو کەسەی پاڵ خۆمم وت ئەی بەندەی خوا، ئایا پێغەمبەر(ﷺ) هیچی لە بارەی منەوە نەفەرمووە؟

ئەویش وتی: با، بە جوانترین شێوە باسی کردیت.

لەکاتی وتارەکەیدا بوو فەرمووی: (لەو دەرگایەوە، یان لەو

لایەوە چاکترین کەسی (یمن)ی دێتە ژوورەوە بۆ لاتان، دەموچاویشی شوێنەواری فریشتەی پێوەیە).

(جریر) دەڵێت: منیش سوپاسی خوام لەسەر کرد.

(جریر) لە حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری کرد و کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست قسە بکات (جریر)ی، دەنارد، تا خەڵکەکە بێدەنگ بکات و هەموان گوێ لە پێغەمبەر(ﷺ) بگرن.

(جریر) دەڵێت: کاتێک (نجاشي) پاشای (حبشة) مرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووین: (نجاشي براتان مرد، دەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن). چونکە (نجاشي) پادشایەکی دادپەروەر و خواناس بوو و بە نهێنیش موسڵمان بوو و یارمەتی زۆری موسڵمانانی دا کاتێک کۆچیان کرد بۆ وڵاتەکەی.

**پەند و وانە:**

نزاکردن بۆ موسڵمان ئەرکی سەرشانی موسڵمانانە، وەک چۆن خوای گەورە لە قورئاندا فێرمان دەکات نزا بکەین بۆ موسڵمانانی پێش خۆمان و موسڵمانانی سەردەمی خۆیشمان، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردوین نزا بکەین بۆ مردووی موسڵمانان بەتایبەت داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەین.

(جریر) کاتێک موسڵمان بوو بەڵێنی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)

لە هەر کوێدا موسڵمانێکی بینی پێویستی بە ئامۆژگاری بوو ئامۆژگاری بکات، ئەمەش بەڵێنیکی چاک و زۆر گرنگیش بوو.

لەو سەردەمەدا ماڵێک دروست کرابوو پێی دەوترا (ذوالخلصة) کە لەبری کەعبە درووستیان کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی پێ خۆش نەبوو و فەرمانی کرد بە (جریر)، تا بڕوات ئەو ماڵە لەناوبەرێت. ئەویش هاودەم بە ژمارەیەک لە هاوەڵان و موجاهیدان چوو و لەناوی برد و خێرا موژدەی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە بە دروستی کارەکەی بەجێگەیاندووە، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کرد.

(جریر) دەڵێت: لەو کاتەوەی موسڵمان بووم هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) منی بدیایە پێدەکەنی، یان زەردەخەنەیەکی دەکرد، ئەمەش نیشانەی ڕووخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، هەروەها بەڵگەی ئەوەیە (جریر)ی خۆشویستووە.

(جریر) دەڵێت: لە (یمن) بووم کە فەرموودەی پێغەمبەرم(ﷺ) دەگێڕایەوە بۆ دوو کەس. ئەوانیش وتیان: ئەگەر وابێت کە دەیلێیت ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) نزیکەی سێ ساڵ دەبێت مردووە. (جریر) دەڵێت: ئەوەبوو لە ڕێدا بووین کە کاروانێک لە (مدینة)وە هات، پرسیارمان لێکردن سەبارەت بە

پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوانیش وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە و (أبوبکر) بووە بە خەلیفە.

(جریر) لە سەردەمی (عمر بن الخطاب)دا بەشداری جەنگی دژ بە بێباوەڕان و دوژمنانی ئیسلامی کرد، (عمر)یش ئەوی کردە سەرکردەی هەموو هۆزەکەی.

(جریر) دەڵێت: جارێک لەگەڵ (عمر بن الخطاب) و ژمارەیەک لە موسڵماناندا بووین، کەسێکیان بایەکی لێ بوویەوە. (عمر) وتی: ئێستا پێی دەڵێم بڕوات دەستنوێژ بگرێت.

(جریر) وتی: بەڵکو فەرمان بکە، با هەموومان دەستنوێژ بگرین.

(عمر) وتی: دەبێت خۆم و هەموویشتان دەستنوێژ بگرین، هەستاین دەستنوێژمان گرت و نوێژمان کرد.

(عمر)یش بە (جریر)ی دەفەرموو: (ڕەحمەتی خوات لێ بێت، لە سەردەمی نەفامیدا گەورەیەکی زۆر چاک بوویت، لە سەردەمی ئیسلامیشدا گەورەیەکی زۆر چاک بوویت).

(جریر) کەسێکی خاکی بوو، (أنس بن مالك) دەڵێت: (جریر) لە من گەورەتر بوو کەچی خزمەتی دەکردم. (أنس) دەڵێت (جریر) خزمەتی دەکردم و دەیوت من دیومە پشتیوانان چۆن خزمەتی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دەکرد، بۆیە هەرکامیان

ببینم خزمەتی دەکەم.

(جریر) لە سەردەمی خیلافەتی (علي بن أبو طالیب) دا چوو بۆ ناوچەی قرقیسیا و لەوێ ژیا، تا وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

١- بۆچی (جریر) کە چوویە مزگەوت هاوەڵان سەیریان دەکرد؟

٢- (ذوالخلصة) چی بوو؟

٣- ڕووداوەکەی ئامۆژگاری (جریر) بۆ (عمر بن الخطاب) چۆن بوو؟

٤- هەڵوێستی (جریر) بەرانبەر بە پشتیوانان باس بکە.

٥- چوار پەند و وانە لە ژیانی (جریر)دا بژمێرە.

## ٢٣- (تميم بن أوس)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵە خۆشەویستەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (تميم بن أوس) بوو، زیاتر بە (تميم الداري) ناسرابوو، (تميم) زۆربەی کات سەرقاڵی پەرستش و قورئان خوێندن بوو.

(تميم)پێشتر مەسیحی بوو، یەکێک بوو لە زانا ئایینییەکانی مەسیحیەکان و لە (فلسطين) دادەنیشت، بەڵام لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا هاتە (مدينة) و لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) موسڵمان بوو، هەر لە (مدينة) مایەوە و لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری نوێژ و پەرستش و غەزاکان بوو.

پرسیار: (تميم)ی داری چۆن موسڵمان بوو؟

وەڵام: (تميم) داری لەگەڵ پێنج کەسی تردا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، لەوێ موسڵمان بوون. هەروەها داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، تا لە خاکی (فلسطين)دا پارچە زەویەکیان پێ بدات، پێغەمبەریش(ﷺ) داواکەی ئەوانی بەجێ گەیاند.

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی

تەواو بوو، لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و پێدەکەنی. فەرمووی: با هەرکەس لە شوێن نوێژەکەی خۆی دابنیشێت، پاشان فەرمووی: (ئایا دەزانن بۆچی،کۆمکردوونەتەوە؟)

وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی، چونکە (تمیم الداري) کە کەسێکی مەسیحی بوو هاتووە و موسڵمان بووە و شتێکی بۆ گێڕاومەتەوە کە پێشتر من شتێکی لەو چەشنەم بۆ باس کردون، ئینجا بەسەرهاتەکەی بۆ هاوەڵان گێڕایەوە.

(تمیم الداري) یەکێک بوو لەو کەسانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) قورئانیان کۆدەکردەوە.

(تمیم الداري) زۆر جار لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دادەنیشت و گوێی لە فەرمایشتەکانی دەگرت و دواتر دەیگێڕایەوە بۆ موسڵمانان. یەکێک لەو فەرموودانەی (تمیم الداري) بۆی گێڕاوینەتەوە ئەوەیە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایین ئامۆژگاریە) واتە: تا بتوانین ئامۆژگاری دەوروبەرمان بکەین، تا چاکە بکەن و دوور بگرن لە هەر خراپەیەک.

(تمیم الداري) جلێکی گرانبەهای کڕیبوو بە هەزار-درهەم- ئەو جلەی زۆر لا جوان بوو، لە شەوای قەدردا ئەو جلەی دەکردە بەر.

جارێک کابرایەک هات بۆ لای (تميم الداري) و داوای لێکرد، فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە، (تمیم) ئامۆژگاریەکی گرنگی کرد و پێی وت: ئەگەر من باوەڕدارێکی بەهێز بم و تۆیش باوەڕدارێکی لاواز بیت بەهێزی من بدەیت بەسەر لاوازی خۆتدا و بتەوێت وەک من بکەیت ناتوانیت و پەکت دەکەوێت، یان تۆ باوەڕدارێکی بەهێز بیت و من باوەردارێکی لاواز بم کاتێک بەهێزی تۆ دەدەم بەسەر لاوازی خۆمدا بەرگەی ناگرم و دەکەوم، بۆیە لە توانای خۆتەوە بنەوە ئایینداریەکەت و پەرستشێک بکە کە بەرگەی بگریت.

**پەند و وانە:**

پێویستە ئێمەش بە وردی گوێ لەو ئامۆژگاریەی (تميم الداري) بگرین و لە ژیانی خۆماندا پەیڕەوی بکەین، نابێت بنەوینە کار و پەرستشێک کە لە توانامان‌دا نییە، چونکە خوای گەورە داوای کردووە بە پێی توانای خۆمان کار و پەرستش بکەین، کەسی وا هەیە توانای هەیە کاری زۆر بکات، کەسی وایش هەیە توانای کەمە. نابێت ئەوەی توانای کەمە زۆر لە خۆی بکات و بیەوێت کارێک بکات کە لە توانایدا نییە.

(تميم الداري) دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و هەر لە (مدینة) سەرقاڵی پەرستش بوو. دوای ئەوەی خەلیفەی

موسڵمانان (عثمان بن عفان) شەهید بوو و ئاژاوەگێڕان دزەیان کردە ناو (مدینة)، ئیتر (تمیم) گەڕایەوە بۆ شام بۆ ناوچەی جارانی خۆی، هەر لەوێ ژیا، تا وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

١- (تمیم)سەرەتا سەر بە چ ئایینێک بوو؟

٢- (تمیم) چۆن موسڵمان بوو؟

٣- یەکێــــک لەو فەرمـــــوودانە بـــــاس بـــــکە کە (تمیم)گێڕاویەتیەوە.

٤- بۆچی (تمیم) گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی؟

## ٢٤- (حمنة بنت جحش) (رضي الله عنها)

هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها پیاو نەبوون، بەڵکو ئافرەتانێکی زۆریش هەبوون هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و لە چاکە و خواناسیدا پێشڕەویەکی زۆریان هەبوو.

یەکێک لەو ئافرەتە خواناسانەش ناوی (حمنة بنت جحش)بوو کە خوشکی (زینب)ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

(زینب) هەر زوو لە (مکة) موسڵمان بوو و هاودەم بە هاوەڵەکانی تر بەرگەی ناڕەحەتیەکانی (مکة)ی گرت و ملی کەچ نەکرد بۆ بێباوەڕانی قورەیش. مێردەکەشی وەک خۆی موسڵمان بوو، ئیتر کە موسڵمانان ئازار و ناڕەحەتییان بەردەوام بوو، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدان کۆچ بکەن بۆ (حبشة). (زینب)یش هاودەم بە مێردەکەی، و سێ برای خۆی کۆچی کرد بۆ (حبشة)، بەڵام لەوێ کە ئایینی مەسیحیەت باو بوو، مێردەکەی (زینب) وازی هێنا لە ئیسلام و بوو بە مەسیحی و هەر بەو باوەڕەوە مرد.

پرسیار: ئەی (حمنة) دوای ئەوە چی کرد؟

وەڵام: دواتر (حمنة) گەڕایەوە بۆ (مكة) و لەوێشەوە کۆچی کـرد بـۆ (مدینـة)و لەوێ لەگەڵ (مصـعب بـن زبیـر)دا هاوسـەرگیری کـرد، بەڵام زۆری نەخایانـد لە غەزای ئوحـوددا (مصـعب) شـەهید بـوو، (حمنـة) خۆیشـی لەنـاو غەزاکەدا بەشـداری کردبـوو ئـاوی دەگێـڕا بـۆ هـاوەڵان و برینپێچـی برینـدارانی دەکـرد و یـارمەتی دەدان. (زینـب) تەنهـا خەمـی شەهیدبوونی مێردەکەی نەبوو، بەڵکو برایەکیشی شەهید بوو، ئیتـر (حمنـة) ناچـار بـوو خـۆی ببێـتە دایـک و بـاوکیش بـۆ منداڵەکەی، چونکە کچێکی هەبوو بە ناوی (زینب).

دوای مـاوەیەک (حمنـة) شـووی کـرد بە هـاوەڵێکی تـری پێغەمبەر(ﷺ) کە ناسراوە بە (طلحة)، لەم مێردەی منداڵێکی بوو کە منداڵەکەی بوو بردی بۆ لای پێغەمـبەر(ﷺ) و ئەویش ناوی نا (محمد).

ئەو کـاتەی لە (مدینـة)دا کێشـەیەکی گەورە ڕوویـدا و بوختانێـک کـرا بـۆ (عائشـة)ی هاوسـەری پێغەمـبەر(ﷺ). دووڕووەکان هێندە بەهێز بوون لە بوختـان کردنەکەیاندا، توانییـان هەندێ موسڵمان لە خشتە بەرن و بەشداری تاوانەکەیان بکەن، یەکێـک لەوانەش (حمنـة) بـوو کە کەوتە داوی دووڕووەکـانەوە، بەڵام ئەمە واتـای ئەوە نییـە کە ئیتـر (حمنـة) خـراپ بووبێـت،

بەڵکو هەڵەیەک بوو تووشی بوو و تەوبەی لێکرد.

پەند و وانە:

زۆر پێویستە وریا بین لە زمانی دووڕوان و بێباوەڕان و کاتێک دژ بە موسڵمانان، یان دژ بە هەر کەسێکی تر قسەیەک دەکەن، خێرا بڕوایان پێ نەکەین و بە وردی بەدواداچوون بکەین بۆ قسەکانیان بزانین ڕاستە، یان نا، ئینجا بڕیاری کۆتایی بدەین. چونکە لەوانەیە پشتگیریەکی بچووکی ئەوان لە بوختانێکدا کە دەیکەن، ببێتە هۆی گرفت و شکستێکی گەورە بۆ موسڵمانان.

(حمنة) لە مزگەوتی (مدینة) لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێژی دەکرد، جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بینی لەنێوان دوو پایەی مزگەوتدا پەتێک بەستراوە، فەرمووی ئەو پەتە چییە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) (حمنة بنت جحش)، تا دەتوانێت بەپێوە نوێژ دەکات کە توانای نەما خۆی دەگرێت بەو پەتەوە. ئەویش فەرمووی: (تا توانای هەیە نوێژ بکات کە توانای نەما، با دابنیشێت).

**پرسیار:**

١- (حمنة) لە کوێ موسڵمان بوو؟

٢- مێردەکەی (حمنة) لە (حبشة) چی بەسەرهات؟

٣- (حمنة) تووشی چ هەڵەیەک بوو باسی بکە؟

٤- بەسەرهاتی (حمنة) لە مزگەوتی (مدینة)دا چۆن بوو؟

٥- گرنگترین رووداوی ئەم بەسەرهاتە لەلای تۆ کامە بوو؟

## ٢٥- (حاطب بن عمرو)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵە خۆشەویستەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (حاطب بن عمرو)بوو، بەڵام باوکی زیاتر بە (أبو بلتعة) ناسرابوو.

ئەم هاوەڵە هەر زوو لە (مكة) موسڵمان بوو و بەرگەی سەختی و نارەحەتیەکانی بێباوەڕانی قورەیشی گرت، کاتێک موسڵمانان مۆڵەتیان پێدرا کۆچ بکەن بۆ (مدينة)، (حاطب)یش هاودەم بە (سعد) کۆچی کرد بۆ (مدينة).

دواتر کەپێغەمبەر(ﷺ) هاتە (مدينة) و لەوێ برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هەریەک لە (حاطب) و (عويم)ی کرد بە برای یەک.

(حاطب) لە ژیانی ڕۆژانەیدا سەرقاڵی کاری بازرگانی خواردەمەنی بوو، لە ڕووی جەنگاوەریشەوە زۆر ناسراو و بەهێز بوو و یەکێک بوو لە تیرهاوێژە زۆر بەناوبانگەکان. لە جەنگی دژ بە بێباوەڕاندا ڕیزی پێشەوەی دەگرت و دلێرانە دەجەنگا و لە

غەزای بەدر و ئوحود و غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو، هەروەها لە ڕێککەوتنی حودەیبیە و بەیعەتی ڕیزوانیشدا بەشداری کرد.

پرسیار: بەیعەتی (الرضوان) چییە؟

وەڵام: بەیعەتی ڕیزوان لە کاتی ڕێککەوتنی حودەیبیەدا ڕوویدا، کاتێک بە درۆ هەواڵ گەیشت کە بێباوەڕان (عثمان بن عفان)یان شەهید کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر سێبەری دارێکدا بوو و داوای کرد لە موسڵمانان بێن و بەیعەت و بەڵێن بدەن تۆڵە لە بێباوەڕان بکەنەوە. موسڵمانانیش بەیعەتیان دا و خوای گەورەش بە ئایەتی قورئان ڕازی بوونی خۆی لەو هاوەڵانە باسکرد.

لە گەرمەی غەزای ئوحوددا (حاطب) دەنگێکی بیست هاواری دەکرد (محمد) کوژرا، ئەمیش تەواو شڵەژا و گەڕا بەدوای پێغەمبەردا (ﷺ)، تا بینی لەگەڵ (علي بن أبو طاليب) دایە و خەریکە دەموچاوی دەشوات. وتی: ئەوە کێ وای لێکردیت؟

وتی: (عتبة بن أبي وقاص).

ئینجا وتی: ئەی (عتبة) بەرەو کوێ چوو؟

ئەویش وتی: ڕووەو فلانە شوێن چوو، خێرا (حاطب) چوو، تا خۆی گەیاند بە (عتبة) و کوشتی و چەک و ئەسپەکەی

(عتبة)ی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەریش(ﷺ) شتەکانی بەخشی بە (حاطب) و نزای خێری بۆ کرد و دوو جار پێی فەرموو خوا لێت ڕازی بێت.

پاش گەڕانەوە لە حودەیبیەوە پێغەمبەر(ﷺ) (حاطب)ی وەک نوێنەر نارد بۆ لای (المقوقس)ی بەرپرسی ئەسکەندەریە. (المقوقس) بانگی کرد و وتی: سەبارەت بەو هاوڕێیەت قسەم بۆ بکە، مەگەر ئەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نییە؟

(حاطب) وتی: با ئەو نێردراوی خوایە.

وتی: ئەی بۆچی کاتێک قەومەکەی دەریانکرد نزای نەکرد لە هۆزەکەی خۆی؟

ئەویش وتی: ئەی تۆ شایەتی دەدەیت (عیسى بن مریم) نێردراوی خوایە؟ ئەی کاتێک قەومەکەی ویستیان لەخاچی بدەن بۆچی نزای نەکرد لێیان، تا ئەوەی خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی؟

(مقوقس) وتی: زۆر جوانە، تۆ کەسێکی دانایت و لەلای دانایەکەوە هاتویت، ئەوەبوو بە (حاطب)دا بڕێک دیاری نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

(حاطب) لەپێش فەتحی (مكة)دا هەڵەیەکی کرد کە خەریک بوو زیانی گەورە بە موسڵمانان بگەیەنێت، جا ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

(علي بن أبو طاليب) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) من و (زبیر) و (مقداد)ی نارد و فەرمووی: (بڕۆن، تا دەگەنە باخچەی خاخ لەوێ ئافرەتێکی لێیە کە نامەیەکی پێیە، ئەو نامەی لێ وەربگرن). ئێمەش خێرا چووین، تا گەیشتینە ئەوێ و بینیمان ئافرەتێکی لێیە. پێمان وت: نامەکەمان بدەرێ.

ئەویش وتی: نامەم پێ نییە.

وتمان: پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین کە تۆ نامەیەکت پێیە. ئافرەتەکە نامەکەی لە نێو پرچەکانی دەرهێنا، بینیمان (حاطب) ئەو نامەی نووسیبوو بۆ بێباوەڕانی ناو (مكة) و هەندێ زانیاری پێغەمبەری(ﷺ) پێگەیاندبوون. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی (حاطب) ئەمە چیە؟)

وتی: ئەی پێغەمبەری(ﷺ) گوێم لێ بگرە، من لەناو قوڕەیشدا کەسێکی بێدەسەڵات بووم، تۆ کۆچەرانێکت لەگەڵە کە خزم و کەسیان هەیە لە (مكة) و ئەو خزمانەیان ژن و منداڵ و ماڵ و سامانیان دەپارێزن. منیش وتم: مادەم هیچ کەس و پشتێکم نییە لەوێ، با بەمە پارێزگاری لە خۆم بکەم، ئەمەشم لەبەرئەوە نەکردووە کە وازم هێنابێت لە ئایینەکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (حاطب) ڕاست دەکات. (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێم بدە بدەم لە گەردنی ئەو دووڕووە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو بەشداری غەزای بەدر بووە، تۆ چووزانیت خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی بەدر و فەرموویەتی چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بوم).

**پەند و وانە:**

دەبێت زۆر وریا بین لە خۆمانەوە ئیشێک نەکەین کە دواتر ببێتە مایەی زیان بۆ ئایین و خاک و خەڵکەکەمان، چونکە جاری وا هەیە کارێک دەکەین و بە سادە و بچووک تەماشای دەکەینەوە، بەڵام ئەنجامی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، بۆیە زۆر پێویستە ڕاوێژ بکەین بە کەسی زانا و گەورەتر لە خۆمان.

جارێک خزمەتکارێکی (حاطب) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و گلەیی هەبوو لە (حاطب) و وتی: بە دڵنیاییەوە (حاطب) دەچێتە دۆزەخەوە. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (درۆت کرد، هەرگیز ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە ئەو لە غەزای بەدر و حودەیبییەدا بەشداربووە). ئەمەش مژدەیەکی خۆش بوو بۆ (حاطب) کە هەرگیز دۆزەخ نەبینێت، واتە بەهەشت شوێنی دەبێت.

دواجار (حاطب) لە سەردەمی خیلافەتی (عثمان بن عفان)دا کۆچی دوایی کرد و تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو، خەلیفەش نوێژی مردووی لەسەرکرد.

**پرسیار:**

١- (حاطب) لە ژیانی ڕۆژانەیدا سەرقاڵی چی بوو؟

٢- بۆچی (حاطب) چوو بۆ لای (مقوقس)؟

٣- کارەکەی (حاطب) چ هەڵەیەکی تێدا بوو؟

٤- بەسەرهاتی خزمەتکارەکەی (حاطب) چۆن بوو؟

٥- دەتوانیت ژیانی (حاطب) باس بکەیت بۆ هاوڕێیەکت؟

## ٢٦- (زبير بن العوام)(رضي الله عنه)

ئەمجارەیان دەچینە خزمەتی یەکێکی تر لە پیاوە هەڵکەوتەکانی ناو هاوەڵان کە هەر لە دنیادا مژدەی بەهەشتی پێ دراوە، ئەویش (الزبیر بن العوام)ە، بە حەواری پێغەمبەر(ﷺ) ناسراوە و پوورزای پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، چونکە دایکی کە ناوی (صفیة)ی خوشکی (عبدالله)ی باوکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

(زبیر) منداڵ بوو کە باوکی کۆچی دوایی کرد، ئیتر (نوفل)ی مامی سەرپەرشتی دەکرد، جا هەندێکجار (صفیة) دەیدا لە (زبیر)، مامیشی دەیوت وا توند لێی مەدە، ئەڵێیت لە دوژمن دەدەیت و ڕقتە لێی، (صفیة)ش دەیوت من بۆ تەمبێ کردن وا لێی دەدەم بۆ ئەوەی بەرگە بگرێت و کەسێکی گەورەی لێ دروست بێت.

(زبیر) تەمەنی نزیکەی شانزە ساڵان بوو کە موسڵمان بوو. (زبیر) چوارەم، یان پێنجەم کەس بوو، موسڵمان بوو و لەسەر دەستی (أبوبکر الصدیق)موسڵمان بوو، لەپێناو ئیسلامدا

نـاڕەحەتی زۆری چەشـت، مـامی (زبیـر) کە زانـی (زبیـر) موسڵمان بووە کەوتە ئازاردانی، لەسەر حەسیرێک ڕایدەکێشا و دواتـر دووکەڵـی بەسـەردا دەکرد، هەر ئازار و ئەشکەنجەیەکی دەدا، تـا (زبیـر) وازبهێنێت لە ئیسلام، ئەویش دەیوت هەرگیـز وازناهێنم.

دواتر (زبیر) هاودەم بە موسڵمانان کۆچی کرد بۆ (حبشة)، بەڵام لەوێ زۆر نەمـایەوە و گەڕایەوە بـۆ (مكـة). دوای ئەوە چـوویە داوای (أسـماء بنـت أبـوبكر) کە هاوسـەرگیرییان کـرد هەردووکیـان پارێزگارییـان کـرد لە دینەکەیـان، تـا ئەو کـاتەی کۆچیـان کـرد بـۆ (مدینـة) و لەوێ کوڕێکیـان بـوو ناویـان نـا (عبدالله).

(زبیـر) لە غەزای بەدردا بەشـداری کـرد و مێزەرێکـی زەردی بەستبوو و ئەسپێکی پێ بوو و لە بەرەی ڕاستەوە بوو، تیایدا دوو جـار بریـندار بـوو، بـرینەکەی هێـندە قـووڵ بـوو کەپەنـجە لە هەر برینێکیـدا ون دەبـوو، لە غەزاکەدا فریشـتەکان لەسـەر شـێوەی (زبیـر) دابەزیـن و مێزەرێکـی زەردیـان لەسـەر بەسـتبوو، هەروەهـا (زبیر) لە غەزای ئوحود و خەندەق و خەیبەریشدا بەشداری کرد. لە خەندەقدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کێ هەواڵـی دوژمنمـان بـۆ دێنێت؟) (زبیـر) وتـی: مـن. پێغەمـبەر(ﷺ) هەمـدی ئەوەی دووبـارە کـردەوە، دووبـارە (زبیـر) وتـی: مـن. پێغەمـبەر(ﷺ)بـۆ جاری سێیەم هەمان شتی دووبارە کردەوە، (زبیـر) هەمـدی وتـی:

مـن. پێغەمـبەر(ﷺ) ئەوکـات فەرمـووی: هەر پێغەمبەرێـک حەواري هەبووە، حەواریەکەی منیش (زبیر)ە.

(زبیـر) له فەتحـی (مکـة)شـدا بەشـدار بـوو و دوو ئـاڵای به دەسـتەوە بـوو، چـونکه پێغەمـبەر(ﷺ) ئـاڵاکەی (سـعد بـن عبادة)شی دایه دەستی، هەروەها ئاڵاکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدەست (زبیر)ەوە بوو.

جارێـک (زبیـر) لەگەڵ پێغەمـبەر(ﷺ) و چەنـد هـاوەڵێکی تـر لەسـەر کێـوی (حـراء) وەسـتابوو، کێـوەکە لەریەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئارام بگرە (حراء)، چونکه ئەوەی بەسەرتەوەیە، یـان پێغەمـبەرە، یـان (صـدیقة)، یـان شـەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەک له پێغەمـبەر(ﷺ) و (أبـوبکر) و (عمـر) و (عثمان) و (علي) و (طلحة) و (زبیر) و (سعد بن أبي وقـاص) لەسەر کێوەکه بـوون، ئەمەش شایەتیەک بـوو بۆ شەهیدبوونی (زبیر).

(زبیـر بـن العـوام) دەڵێـت: پێغەمـبەری خوا(ﷺ) فەرمـووی: (ئەگەر یەکێـک له ئێـوە گوریسـەکەی هەڵگرێـت و کۆڵێـک داری پـێ بهێنێـت و بیـدات به کۆڵیـدا و بیبـات بیفرۆشـێت ... ئەوە زۆر باشـترە بـۆی لەوەی داوا له خەڵـک بکـات، ئیتـر ئایـا پێیبدەن، یان پێی نەدەن).

## پەند و وانە:

سوالّکردن کارێکی ناپەسەند و خراپە و منداڵی موسڵمان دەبێت هەر لە سەرەتاوە خۆی فێری ئیشێکی پاک و چاک بکات، تا لە داهاتوودا خۆی بژێوی ژیانی پەیدا بکات و داوا لە کەس نەکات، چونکە خوای گەورە ئەوەی پێ خۆشە.

(عمر بن الخطاب)دەڵێت: جارێک بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەوتبوو و (زبیر)یش لە کەناریەوە دانیشتبوو و باوەشێنی دەکرد و مێشوولەی لێ دووردەخستەوە، هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لە خەو هەستا (زبیر) هەر وایکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) هەستا فەرمووی: (تا ئێستاش هەر بەردەوامیت) ئەویش وتی: بەڵێ، بەدایک و باوکمەوە بەقوربانت بم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە (جبریل)ە سەلامت لێدەکات و دەفەرمویت: من لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵت دەبم و گڕی دۆزەخ لە دەموچاوت دوور دەگرم).

(زبیر) دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە خەلیفەکانەوە نزیک بوو و لە جەنگ و جیهادی ڕێی خواشدا بەشداری کرد، لە سەردەمی (عمر)دا (صفية)ی دایکی کۆچی دوایی کرد، خەلیفە نوێژی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی (بقیع) ئەسپەردە کرا.

کاتێک (عثمان بن عفان) شەهید کرا، (زبیر) زۆر خەفەتی

بەوە خوارد و بەڵێنی دا تۆڵە لە بکوژانی بکاتەوە، بۆیە لەگەڵ (عائشة)ی دایکی باوەڕداران و (طلحة)دا چوون بەرەو (بصرة)، تا لەوێ سوپا کۆبکەنەوە و بکوژانی (عثمان) لەناوبەرن، خەلیفەی موسڵمانانیش کە (علي بن أبو طاليب)بوو وایزانی لە دژی ئەو کۆبوونەتەوە، بۆیە چوو تا لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە، هەردوولا دانیشتنیان کرد و لەوە تێگەیشتن مەبەستی هەردووکیان لەناوبردنی بکوژەکانی پێشەوا (عثمان)ە، بۆیە بڕیاریان دا بگەڕێنەوە، بەڵام بکوژانی پێشەوا (عثمان) کە بەمەیان زانی وتیان: ئەگەر شتێک نەکەین ئەمانە لەناومان دەبەن، دواجار پیلانیان دانا ببن بە دوو بەشەوە، هەر بەشێکیان بچێتە ناو یەکێک لەو دوو سوپایە و لەوێوە دەست بکەن بە تیر هاویشتن بۆ ئەوەی جەنگ ڕووبدات و ئەمان ڕزگاریان بێت، پیلانەکەشیان سەری گرت و جەنگەکەیان هەڵگیرساند، (زبیر) کە زانی ناحەزان جەنگەکەیان هەڵگیرساندووە وازی لە جەنگ هێنا و کەناری گرت، بەڵام یەکێک لە ناحەزەکان هات و (زبیر)ی شەهید کرد.

**پەند و وانە:**

دەبێت وریای پیلانی دووڕووان و دوژمنانی ئیسلام بین، ئەوان دەزانن دەرەقەتی موسڵمانان نایەن، بۆیە هەموو هەوڵیان ئەوەیە نێوانی موسڵمانان تێکبدەن و جەنگی ناوخۆیی لەنێویاندا هەڵبگیرسێنن، بۆیە هەرکات کەسێک ویستی نێوانمان لەگەڵ کەسێکی موسڵمان تێک بدات، دەبێت بە وردی بە دوای قسەکانیدا بچین بزانین ڕاست دەکات، هەروەها وریابین تەڵەمان بۆ نەنێتەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر(ﷺ) لە بەهەشتدایە، (أبوبكر) لە بەهەشتدایە، (عمر) لە بەهەشتدایە، (عثمان) لە بەهەشتدایە، (علي) لە بەهەشتدایە... (الزبير بن العوام) لە بەهەشتدایە ...).

**پرسیار:**

١- (زبیر) چۆن موسڵمان بوو؟
٢- خزمایەتی (زبیر) و پێغەمبەر (ﷺ) چۆن بوو؟
٣- باسی هاوسەرگیری (زبیر) بکە.
٤- پیلانی ناحەزان بۆ تێکدانی نێوان موسڵمانان چۆن بوو؟
٥- بە پێی کام فەرموودە (زبیر) دەچێتە بەهەشتەوە؟

## ٢٧- (سعید بن زید)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵە موژدەپێدراوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە موژدەی بەهەشتی پێدراوە ناوی (سعید بن زید)ە، ئەم هاوەڵە یەکێکە لەوانەی زۆر زوو موسڵمان بوو.

(زید)ی باوکی بۆ ئەوەی بتەکانی (مکة) نەپەرستێت چوو بەرەو شام و لەوێ ئایینی جوولەکە و مەسیحیەتی بینی، بەڵام دینداریەکەی ئەوانیشی بەدڵ نەبوو، بۆیە وتی خوایە، من لەسەر دینی ئیبراهیم پێغەمبەرم.

(سعید) دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوکم بەو حاڵەوە مرد کە دەتزانی، ئەگەر بگەیشتایە بە سەردەمی تۆ بە دڵنیاییەوە باوەڕی پێ دەهێنایت، دەی ئایا داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی بەڵێ، ئەو لە ڕۆژی دواییدا بە تەنها وەک ئوممەتێک زیندوو دەکرێتەوە.

(سعید) لەسەر ئیسلام ئازار و ئەشکەنجەی چەشت، خۆی دەڵێت: (عمر بن الخطاب)پێش ئەوەی موسڵمان بێت لەسەر موسڵمان بوونم من و خوشکەکەی، خۆیشی دەبەستەوە، چونکە

خوشکەکەی (عمر) هاوسەری (سعید) بوو.

(سعید) کۆچی کرد بۆ (مدینة) کە گەیشتە ئەوێ لە ماڵی یەکێک لە هاوەڵە پشتیوانییەکان دابەزی کە ناوی (رفاعة) بوو.

(سعید) لە غەزای بەدردا لە (مدینة) نەبوو، بۆیە نەیتوانی بەشداری غەزای بەدر بێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکاندا بەشی (سعید)ی دانا، بەڵام لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، دواتریش بەشداری غەزاکاتی تری کرد.

پرسیار: بۆچی (سعید) لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد؟

وەڵام: چونکە (سعید) ئەو کاتە چووبوو بۆ شام، تا گەڕایەوە غەزاکە تەواو بووبوو.

(سعید) ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) مۆژدەی بەهەشتی دە کەسی داوە، (سعید) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر(ﷺ) لە بەهەشتدایە، (أبوبکر) لە بەهەشتدایە، (عمر) لە بەهەشتدایە، (عثمان) لە بەهەشتدایە، (علي) لە بەهەشتدایە، (طلحة بن عبیدالله)لە بەهەشتدایە، (الزبیر بن العوام) لە بەهەشتدایە، (سعد بن مالك) لە بەهەشتدایە، (عبدالرحمن بن عوف) لە بەهەشتدایە)، ، ئینجا

وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان: کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد، تا بیلێت؛ ئەویش وتی (سعید بن زید).

کاتێک (عمر بن الخطاب)وەفاتی کرد، (سعید) زۆر گریا، پێیان وت: بۆچی دەگریت؟ وتی: بۆ ئیسلام دەگریم، گورزێکی بەرکەوتووە، تا ڕۆژی دوایی شوێنەواری دەمێنێت.

جارێک ئافرەتێک چوو بۆ لای (مروان بن الحکم) کە والی (مدینة) بوو. وتی (سعید) بەشێک لە زەویەکەی منی داگیر کردووە، (مروان)یش ناردی بە شوێن (سعید)دا، تا لێپێچینەوەی لەگەڵ بکات. (سعید) وتی: من شتی وام نەکردووە، خوایە، ئەگەر ئەم ئافرەتە درۆ دەکات چاوەکانی لێ وەرگریتەوە و لە زەوی خۆیدا بیکوژیت، ئەوەبوو ئەو ئافرەتە نەمرد، تا بینایی لەدەستدا، پاشان جارێک بەناو زەویەکەیدا دەڕۆیشت کەکەوتە چاڵێکەوە و مرد.

دواجار (زید) لە کووفە و لە ساڵی پەنجا و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد، تەمەنی نزیکەی حەفتا و ئەوەندە ساڵ بوو، (عبدالله بن عمر) تەرمەکەی شۆرد و کفنی کرد و نوێژی لەسەر کرد.

**پرسیار:**

١- پەیوەندی نێوان (سعید) و (عمر بن الخطاب)چۆن بوو؟

٢- بۆچی (سعید) بەشداری غەزای بەدری نەکرد؟

٣- ئەو فەرموودەی (سعید) گێڕایەوە کامەیە؟

٤- بەسەرهاتی (سعید) و ئافرەتەکە چی بوو؟

٥- ئەم ژیانە بۆ یەکێک لە خۆشەویستەکانت باس بکە.

## ٢٨- (طلحة بن عبيدالله)(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە موژدەپێدراوانی بەهەشت ناوی (طلحة بن عبيدالله)یە، ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانە یەکێکە لەو هەشت کەسەی کە یەکەمجار موسڵمان بوون.

کاتێک (أبوبکر) موسڵمان بوو خێرا چوو بۆ لای (عثمان بن عفان) و (طلحة بن عبيدالله) و (الزبير بن العوام) و (سعد بن أبي وقاص) و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، هەموو ئەوانیش موسڵمان بوون. ئەمانە چوونە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش باسی ئیسلامی بۆ کردن و قورئانی خوێندەوە بۆیان و مافەکانی ئیسلام و بەڵێنی خوای بۆ خستنەڕوو، ئەوانیش باوەڕیان هێنا.

(طلحة) دەڵێت: جارێک لە بازاڕی بوصرا بووم کە ڕاهیبێک (خواناسێکی مەسیحی) لە پەرستگاکەی خۆیدا بوو، وتی: پرسیار بکەن لەم خەڵکە بزانن کەسیان تێدایە خەڵکی (مكة) بێت؟

منیش وتم: بەڵێ، من.

وتی ئایا هێشتا (احمد) دەرنەکەوتووە؟

وتم: (احمد) کێیە؟

وتی: کوڕی (عبدالله)، ئەو کۆتای پێغەمبەرانە و لە (مکة) دەردەکەوێت و کۆچ دەکات بۆ شاری دارخورما (مدینة)، وریابە زوو خۆتی پێ بگەیەنە. منیش قسەکانی چوویە دڵمەوە و خێرا گەڕامەوە بۆ (مکة) و وتم: هیچ ڕوویداوە؟

وتیان:(محمد بن عبدالله) باسی پێغەمبەرایەتی دەکات و (أبوبکر)یش شوێنی کەوتووە، منیش چوم، تا خۆم گەیاند بە (أبوبکر) و وتم: ئایا شوێنی ئەو پیاوە کەوتویت؟

وتی: بەڵێ، تۆیش بڕۆ شوێنی بکەوە، چونکە بانگەواز بۆ حەق دەکات. منیش بەسەرهاتەکەم بۆ باسکرد، (أبوبکر)یش لەگەڵم هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ موسڵمان بووم و بەسەرهاتەکەشم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە و ئەویش بەوە دڵخۆش بوو.

**پەند و وانە:**

لە هەموو ئایینەکانی پێش ئیسلامدا باسی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام کراوە و زاناکانیان ئەومیان دەزانی، جا کاتێک باوەڕیان نەهێنا، ویستیان خەڵکی تری سەر بە ئایینەکەیان شوێن ئیسلام

نەکەون، بۆیە دەستکاری دەقەکانی ناو کتێبە پیرۆزەکانیان کرد و لە هەر شوێنێدا باسی پێغەمبەری ئیسلامی تێدا بوایە، دەیانسڕیەوە.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی کۆچ بکات بۆ (مدینة)، (طلحة) لە (شام)ەوە جلی سپی ناوازەی هێنابوو. دوو جلی بە دیاری نارد بۆ (أبوبکر) و پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوانیش ئەو جلانەیان پۆشی و بەو جلانەوە چوونە ناو (مدینة).

پێش ئەوەی غەزای بەدر ڕووبدات، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی زانی کە کاروانی قورەیشیەکان دەگەڕێتەوە، بۆیە (سعید بن زید)ی هاودەم بە (طلحة) نارد، تا هەواڵی کاروانەکەی بۆ بهێنن، ئەوانیش زانیاری وردیان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

(طلحة) لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد، چونکە لەو کاتدا لە شام بوو و خەریکی بازرگانی بوو، دواتریش زۆر دڵتەنگ بوو بەو ئامادەنەبوونەی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوت و پاداشتدا بەشداری کرد.

(طلحة) لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و ڕۆڵێکی کارای بینی، کاتێک خەڵکی لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بڵاوەیان کرد، تەنها دوانزە کەس لە دەوری مانەوە، یەکێک لەوانە (طلحة) بوو، جا بێباوەڕان دەیانویست خۆیان بگەیەنن بە پێغەمبەر(ﷺ)،

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ بەرانبەریان دەوەستێت؟

(طلحة) وتی: من.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە شوێنی خۆت بە.

یەکێک لە پشتیوانان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

فەرمووی: دەی تۆ بجەنگە، کابرا جەنگا، تا شەهید بوو، دواتر تەماشای کرد هێشتا بێباوەڕان دێن. فەرمووی: کێ ڕێیان پێ دەگرێت؟

ئەمجارەش (طلحة) وتی: من. پێغەمبەر(ﷺ) هەمان شتی پێ فەرموو، ئەمجارەش کابرایەکی پشتیوانی چوو، تا ئەویش شەهید بوو، بەردەوام بەو جۆرە بوو، تا هەموو پشتیوانییەکانی دەوری شەهید بوون. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ ڕێیان پێ دەگرێت؟ (طلحة) وتی: من. جەنگی یانزە کەسی کرد، تا شمشێر بەر دەستی کەوت و پەنجەکانی بڕا، (طلحة) وتی ئاخ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر بتوتایە بەناوی خوا، فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوە و خەڵکیش تەماشایان دەکرد. دواتر خوای گەورە بێباوەڕانی تێکشکاند.

(طلحة) لە غەزای خەندەق و سەرجەم غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ڕێزی لە توانا و چاکی (طلحة) دەنا، ئەوەبوو هەرجارە و نازناوێکی لێ دەنا.

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (هەرکەس حەز دەکات سەیری شەهیدێک بکات کە بەسەر زەویدا دەچێت بە ڕێدا، ئەوە با تەماشای (طلحة بن عبیدالله)بکات).

جارێک پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر کێوی حیرا وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئارام بگرە حیرا، چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە، یان پێغەمبەرە، یان صدیقە، یان شەهیدە). ئەو دەمەش هەریەک لە پێغەمبەر(ﷺ) و (أبوبکر) و (عمر) و (عثمان) و (علي) و (طلحة بن عبیدالله)و (زبیر بن العوام)و (سعد بن أبي وقاص) لەسەر کێوەکە بوون.

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (طلحة بن عبیدالله) لە بەهەشتدایە).

(طلحة) لە سەردەمی خیلافەتی (أبوبکر الصدیق) و (عمر بن الخطاب)یشدا ژیانێکی ئاسایی بردەسەر، لە دواساتەکانی خیلافەتی (عمر بن الخطاب)یشدا، پاش ئەوەی (عمر بن الخطاب)پێکرا، شەش کەسی ڕاسپارد، تا لەنێو خۆیاندا کەسێک دیاری بکەن بۆ خیلافەت. ئەوانیش بریتی بوون لە: (علي بن أبو طالێب)، (عثمان بن عفان)، (طلحة بن عبیدالله)، (الزبیر بن العوام)، (سعد بن أبي وقاص)، (عبدالرحمن بن عوف)، ئەوەبوو (عثمان بن عفان)یان کرد بە خەلیفە.

کاتێـک (عثمـان بـن عفـان) شـەهید کـرا، (طلحـة) زۆر خەفەتی بەوە خوارد و بەڵێنی دا تۆڵە لە بکوژانی بکاتەوە، بۆیە لەگەڵ (عائشـة)ی دایکـی بـاوەڕداران و (زبیـر)دا چـوون بەرەو (بصـرة)، تـا لەوێ سـوپا کـۆبکەنەوە و بکـوژانی (عثمـان) لەناوبەرن، خەلیفەی موسڵمانانیش کە (علي بن أبو طالیب) بـوو وایزانـی لە دژی ئەو کۆبـوونەتەوە، بـۆیە چـوو تـا لە مەسـەلەکە بکۆڵێتەوە، هەردوولا دانیشتنیان کرد و لەوە تێگەیشتن مەبەستی هەردووکیـان لەنـاوبردنی بکوژەکـانی پێشـەوا (عثمـان)ە، بـۆیە بڕیاریـان دا بگەڕێـنەوە، بەڵام بکـوژانی پێشـەوا (عثمـان) کە بەمەیـان زانـی وتیـان: ئەگەر شـتێک نەکەیـن ئەمـانە لەناومـان دەبەن، دواجـار پیلانیـان دانـا ببن بە دوو بەشـەوە، هەر بەشێکیان بچێتە ناو یەکێک لەو دوو سوپایە و لەوێوە دەست بـکەن بە تیـر هاویشـتن بـۆ ئەوەی جەنـگ ڕووبـدات و ئەمـان ڕزگاریـان بێـت، پیلانەکەشیان سەری گرت و جەنگەکەیان هەڵگیرساند. (زبیـر) کە زانـی نـاحەزان جەنگەکەیـان هەڵگیرساندووە وازی لە جەنـگ هێنـا و کەنـاری گـرت. بەڵام یەکێـک لە ناحەزەکـان هـات و (زبیر)ی شەهید کرد.

**پەند و وانە:**

دەبێت وریای پیلانی دووڕووان و دوژمنانی ئیسلام بین، ئەوان دەزانن دەرەقەتی موسڵمانان نایەن، بۆیە هەموو هەوڵیان ئەوەیە نێوانی موسڵمانان تێکبدەن و جەنگی ناوخۆیی لەنێویاندا هەڵبگیرسێنن، بۆیە هەرکات کەسێک ویستی نێوانمان لەگەڵ کەسێکی موسڵمان تێک بدات، دەبێت بە وردی بە دوای قسەکانیدا بچین بزانین ڕاست دەکات، هەروەها وریابین تەڵەمان بۆ نەنێتەوە.

**پرسیار:**

١- هۆکاری موسڵمانبوونی (طلحة) چی بوو؟
٢- بۆچی (طلحة) لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد؟
٣- پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە (طلحة) چی بە هاوەڵان فەرموو؟
٤- (طلحة) بۆ تۆڵەی خوێنی (عثمان بن عفان) چی کرد؟
٥- ئەم ژیانە بۆ کەسێکی خۆشەویستت باس بکە.

## ٢٩- ناوەڕۆك



ژیانی هاوەڵانی خۆشەویستمان بەڕاستی پێویستە بیانکەین بە سەرمەشق بۆ خۆمان و منداڵ و نەوەکانمان، تا ڕێی سەرفرازی بگرین.

لێرەدا ژیانی هاوەڵانمان بە نموونە هێناوە و لە شێوەی گێڕانەوەی ژیانیان و پرسیار و وەڵام و پەند و ئامۆژگاریدا ژیانی هەرکام لەوانمان هێناوە، دواجاریش کۆمەڵێکک پرسیارمان داناوە، تا منداڵی ئازیز بەدوای وەڵامەکانیاندا بگەڕێت کەوەڵامەکانیشیان لە خودی ئەم نووسینەدا هەن.

بەو هیوایەی خوای گەورە ئەم کارەی لێوەرگرتبین و پاک و پوخت تەنها لەپێناو خۆیدا بێت.

خەڵکیش بە گشتی و منداڵی موسڵمان بە تایبەتی سوودی لێ ببینن


نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٦٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice


